سەرپەرشتیار
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
کامەران سوبحان

دەرهێنەری هونەری
ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ
ئارام عەلی

تایپیست
ئارام مەحمود

هەڵەچنی
سەلام مستەفا

ڕۆڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی
تایبەتە بەداهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێك دەریدەکات

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ژمارەی تەلەفۆن
3120890

Web Site
www.serdem.net

پەیوەندیکردن بە ڕۆڤارەوە لەرێگەی
ئیمێلی
Rovar.rovar@yahoo.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

پۆرترێتی بەرگ و هێڵکارییەکانی ئەم ژمارەیە
هونەرمەند (عەلی کەریم)

72

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، جگەر خوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی،حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، ملا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادر، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزا، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحوی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورە.

پێڕست

# تۆفیق وەهبی
# گوڵە هێرۆی سەرلق سپی

ئەم ژمارەیەی ڕۆڤارمان تایبەت کردووە بە یەکێك لە نووسەر و ڕۆشنبیر و مێژوونووس و سیاسەتمەدارێکی ناوداری نەتەوەکەمان کە (تۆفیق وەهبی)یە. بە زمانە شیعرییەکەی کاك شێرکۆ بێکەس (تۆفیق وەهبی گوڵە هێرۆی سەرلق سپی!) بەهیوای ئەوەی ئەم ژمارەیەمان بگاتە باڵای بەرزە فڕی داهێنانی ئەو پیاوە ڕووناکبیرو پایە بەرزەی نەتەوەکەمان. ئێمە نامانەوێت لەم پێشەکییە کورتەدا ژیاننامە و وێستگە گرنگەکانی ژیانی تۆفیق وەهبی بۆ خوێنەران هەڵبدەینەوە، چونکە زۆرێك لەو نووسەرانەی کە لەم ژمارەیەدا بەشداربوون هەریەکەیان بە شێوازێکی جیاواز تیشکی خستووەتە سەر لایەنێك لە لایەنە پرشنگدار و گەشەکانی ئەم ڕۆڵە ڕۆشنبیرەی نەتەوەکەمان.

* گەر سەیری بەرهەم و کتێب و وتارەکانی تۆفیق وەهبی بکەین، دەبینین ئەو پیاوە لە ئینسکلۆپیدیایەك دەکات نەك تەنیا نووسەرێك بێت و لە تەنها بوارێکدا بەرهەمەکانی بڵاوبکاتەوە، بەرهەمەکانی ئەو لە بوارەکانی (زمانەوانی، ئەدەب، مێژوو، لێکۆڵینەوە، گەشت، فەرهەنگ، ساغکردنەوە)دان، هەروەك د.کەمال مەزهەر لە وتارەکەی ئەم ژمارەیەی ڕۆڤاردا ئاماژەی بۆ دەکات کە تۆفیق وەهبی لە هەر بوارێکدا زانیبێتی نەتەوەکەی لاواز و پێویستی بە قەڵەمەکەی ئەوە ئەوا بە بێ دوودڵیی و بە دڵسۆزییەکی زۆرەوە لەو بوارەدا کاری کردووە و هەوڵەکانی خۆی خستووەتە گەڕ بۆ کارکردن و نووسین و ساغکردنەوەی بابەت و تەوەرەکان.

*یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار ئەوەیە کە زۆرێك لەو بابەت و لێکۆڵینەوانەی لەم ژمارەیەدا بڵاوکراونەتەوە ئەو نووسەرانە لەسەر داوای ڕۆڤار نووسیوویانە و بە پێچەوانەی هەندێ ژمارەی تری (ڕۆڤار) نەگەڕاوین بەدوای ئەو وتارانەدا کە پێشتر بڵاوکراونەتەوە.

*شتێکی تر زۆر گرنگە بەلامانەوە ئاماژەی بۆ بکەین، ئەویش ئەوەیە کە لە خولی نوێی ڕۆڤاردا هەمیشە بۆ هەموو ژمارەکان کۆمەڵێك نووسەر و ڕۆشنبیر و دەزگای تایبەتی ماندوو نەناسانە هاوکارییان کردووین، بۆ ئەم ژمارەیە ناکرێت هەوڵی دڵسۆزانە و خەمخۆرانەی مامۆستا سدیق ساڵح لە یاد بکەین، کە بەبەخشینی چەندین وێنەی دانسقەی تۆفیق وەهبی و وتار و بابەتی نووسەران هاوکاریی کردین لە پێناو دەوڵەمەندکردنی بابەتەکانی ڕۆڤاردا.

* ئەوەی ماوەتەوە ئاماژەی بۆ بکەین، ئاگادارییەکە بۆ نووسەران و خوێنەرانی (ڕۆڤار) کە لە ئێستادا سەرقاڵی ئامادەکردنی ڕۆڤارێکی نوێین بۆ مێژوونووسی گەورەی کورد (محەممەد ئەمین زەکی بەگ)ی خاوەنی شاکاری (خولاسەی تەئریخی کورد و کوردستان) لێرەوە داوا لە نووسەران و خوێنەرانی (ڕۆڤار) دەکەین هەرکەس دەتوانێت بەشداری ژمارەی داهاتووی ڕۆڤارمان بکات بە نووسین و وێنە و بابەتی تایبەتمەند بەو مێژوونووسە گەورەیەی کورد و پێشەکی سوپاس گوزارین.

ڕۆڤار

تۆفیق وەهبی

گوڵە هێرۆی سوزالیق سپی!

•

هەموو کاتێ

بە ڕۆژ بێ یان شەوان درەنگ

بە سەر "پیرەمەگروون"ەوە

ڕۆحی لە هاتوچۆدایە.. سپی سپی

دەمێک پەروانەیە ڕۆح و

دەمێکی تر شیعرێکی باڵداری "نالی"،

لە دەربەندی بەسامیشە!

جارێ ئەبێ بە باڵاو شاوێنەی بەفرو

جارێکی تر بە گێلاخەی دەوری کانی.

بە ڕۆژ بێ یان شەوان درەنگ"

ڕۆحێک لەویێ، لەگەڵ گیل نووسینی کۆندا

دێت و ئەچێ و دێڕی سەر گیل

هەر ئەم و خودا تێی ئەگا

چی ئەڵێت و چۆن ئەنووسرێ!.

ڕۆحێک لەویێ، بە ڕۆژ بێ یان شەوان درەنگ

لە ساماندا یان سپیلقە

دەمێک ئەبێ بە ئەشکەوت و

یان داربەڕووی هەزار ساڵە و لەناکاویش

لە گۆشەیەکی تاریکدا ئەبێ بە چل چرای شەبەنگ،

بە سەر پیرەمەگروونەوە ڕۆحی لە هاوڕێشەو وردایە

دێت و ئەچێ و لەم سەرا ئەبێ بە مێژووی بارد

لەو سەرا ئەبێ بە تیزیژی "گاتاکان" و

بە هێماکانی "ئاڤێستا" و بە زمانی "سانسکریتی" و

ئینجا ئەچێتە باڵەموی ڕیشی "زەردەشت"

پیاوێک لە سەر ئەو شاخەیە

لەگەڵ "مانگ"دا دێت و ئەچێ

دەستی لەناو دەستی "بابا" دایە

دڵی لای "مەلا"ی ناوبەس" و

چاوێشی هەر لە سەر خەمی سلێمانی!.

پیاوێک لەویێ لە سەر لوتکە ڕاکشاوە

ئەو... مردن جێی هێشتووە و

گەیشتۆتە ناو نەمری

تۆفیق وەهبی!

شێرکۆ بێکەس

سلێمانی ٢٦/١٢/٢٠١٢

(57)

# تۆفیق وەهبی

د.مارف خەزنەدار

وێنەی کۆمەڵێک لە ڕۆشنبیرانی کورد لە بارەگای یانەی سەرکەوتنی کوردان لە بەغدا دەوری تۆفیق وەهبیان داوە، لەناویاندا عەبدولقادر حیشمەت و عەبدولڕەحمان نورجان و محەمەد بریفکانی و محەمەد عەلی کوردی و مارف خەزنەدارو هی دیکە دەکەونە بەرچاو. ئەم وێنەیە لە ئێوارەیەکی ڕۆژانی بەهاری ساڵی ١٩٥٦ گیراوە.

## بۆچی تۆفیق وەهبی؟

**کاتێك لە ڕێگەی پەیجی ڕۆڤارەوە لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوك بیستم کە دواهەمین ژمارەی ئەو بڵاوکراوە سەنگینە لەسەر نووسەر و زمانناس و مێژوونووسی گەورەی نەتەوەکەمان (مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ)ە، پێم خۆش بوو بە وتارێك بەشداری ئەو ژمارەیەیان بکەم.**
**کاتێکیش کە بیرم لە وتارەکانی پێشووی نووسەرانی تری وەك (د.مارف خەزنەدار، عەزیز گەردی، د.کەمال مەزهەر، کەمال ڕەئوف محەمەد، ڕەفیق حیلمی و چەندانی تر)کردەوە کە لەسەر ئەو نووسیوویانە لەخۆمەوە توانستی ئەوەم نەبوو بەشداری ئەو ژمارەیە بکەم، بەڵام هەمیشە ڕۆحی دەروێشیم بۆ ئەو نووسەر و ڕۆشنبیرە گەورەیە پێم خۆش بوو بە وتارێك بەشداری ئەو ڕۆڤارە بکەم، بۆیە بەباشم زانی بۆ نەوەی نوێ خوێندەوارانی کورد بە پوختەیەك لە ژیان و بەرهەم و چالاکییەکانی تۆفیق وەهبی ئاشنایان بکەم، هەر بۆیە لێرەدا و لەم نووسینە کورتەدا تەنها ئاماژە بەو نووسین و وێستگە گرنگانە دەدەم کە ئەم ڕۆڵە دڵسۆزەی کورد پێیدا تێپەڕیووە.**

(١ی کانوونی دووەمی ١٨٩١-٥ی کانوونی دووەمی ١٩٨٤ز) نووسەر، زمانەوان، مێژوونووس، سیاسەتمەند و ئەفسەری سەربازی بەناوبانگی کورد بوو.کۆلێژی سەربازی لە ئەستەمبوڵ تەواو کردووە و بووە بە ئەفسەر، ساڵی ١٩٢٩ کراوە بە فەرماندەی کۆلێژی سەربازیی لە بەغدا، دواتر لە ساڵی ١٩٣٠ کراوە بە موتەسەریفی پارێزگای سلێمانی و پێش ڕاپەڕینەکەی بەردەرکی سەرای سلێمانی لەسەر کار لابراوە.
ساڵی ١٩٤٣ بووە بە وەزیری ئابووریی و ساڵی ١٩٤٨ بووە بە وەزیری مەعاریف، ئەندامی کۆمەڵەی جوگرافیاناسانی بەریتانیا بووە. شەش زمانی زانیوە، لە چلەکانی سەدەی ڕابردوودا ڕۆڵێکی بەرچاوی لە سیاسەتی عێراقدا هەبووە. زۆر شارەزایی لە بواری شوێنەوارناسیی کوردستاندا هەبووە، چەندین نووسینی لەو بارەیەوە بڵاوکردۆتەوە.

## ژیان:

تۆفیق وەهبی بەگ کوڕی مەعرووف، لە ١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٩١دا لە شارۆچکەی چوارتای سەر بە شاری سلێمانی لە دایکبووە.
هەر منداڵ بووە کە باوکی مردووە، خوێندنی سەرەتایی لە سلێمانی تەواو کردووە و لە ساڵی ١٩٠٤دا چۆتە بەغدا و خوێندنی ناوەندیی و ئامادەیی سەرەبازی بە زیرەکی تەواو کردووە. ئینجا ڕووی کردۆتە شاری ئەستەمبوڵی پایەتەختی دەوڵەتی عوسمانی بۆ تەواو کردنی خوێندنی باڵاتری، لە کۆلێژی ئەرکان وەرگیراوە و بۆتە ئەفسەری ڕوکن لە سوپای عوسمانی.
کە جەنگی یەکەمی جیهانیی لە ساڵی ١٩١٤دا دەستی پێکرد، بەشداری لە شەڕی «چەنە قەلعە» لە دەردەنیل دا کردووە و لە دواییدا ڕەوانەی خوارووی ئێراق کراوە بۆ بەشداری کردن لە بەرەی جەنگ لە دژی هێزەکانی بریتانیا لە «شعێبە» و لە کاتی کشانەوەی سوپای عوسمانی بەرامبەر بە هێزەکانی بریتانیا لە مانگی ئەیلولی ١٩١٧دا بەشداریی کردووە لە بەرەی جەنگی ڕومادی و کاتێکیش کە ئەو شارە کەوتۆتە چنگ هێزەکانی بریتانیا ئەم بەخۆی و لەشکرەکەیەوە بەرەو شاری هیت کشاوەتەوە.
لە ساڵی ١٩١٨دا گواستراوەتەوە بۆ بەرەی جەنگی فەلەستین و پایەی سەربازی بەرز کراوەتەوە بۆ پلەی ڕائید و مەدالیای قارەمانی لەسەرکردەی ئەڵمان وەرگرتووەو ئەوەی شایانی باسە زۆربەی سەرکردەکانی تیپی سوپای عوسمانی ژەنەڕاڵی ئەڵمان بوون، چونکە لەو جەنگەدا عوسمانی و ئەڵمانیا هاوپەیمان بوون لە دژی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتاڵیا و ئەمەریکا شەڕەیان دەکرد.
کاتێك کە ئەو جەنگە جیهانییە بە شکانی دەوڵەتی عوسمانی و هاوپەیمانەکانی لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨دا کۆتایی هات، تۆفیق وەهبی بەگ گەڕایەوە کوردستان و ئینجا چووە بەغداو بووە یەکێك لە ئەفسەرە دیارەکانی کورد لە دامەزراندنی سوپای ئێراق لە ڕۆژی ٦ی کانوونی دووەمی ١٩٢١دا.
کاتێك کە شێخ مەحموودی حەفید لە ساڵی

١٩٢٢دا لە هیندستان گەڕێنرایەوە سلێمانی و بووەوە پاشای کوردستان، تۆفیق وەهبی بەگ لە مانگی تشرینی یەکەمی ئەو ساڵەی ١٩٢٢دا چووە پاڵ بزووتنەوەکەی ئەم سەرکردەیەی کورد و کە ئەم بزووتنەوە و فەرمانڕاوەکەی شێخی حەفیدیش بە دەستی ئینگلیزەکان لە ناوبران، تۆفیق وەهبی بەگ بۆ ماوەی ٤٢ ڕۆژ گیرا و کە ئازادکرا لە دوا دوای ساڵی ١٩٢٣دا کرا بە کارگێڕی بزوتنەوەکان لە شالیاریتی بەرگری ئێراق و لە مانگی ئابی ١٩٢٥یشدا کرا بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەربازیی لە بەغدا و پلەی سەربازیی بووە موقەددەم و لە ساڵی ١٩٢٩ دا ناردرا بۆ ئینگلتەرە بۆ بەشداریی کردن لە خولێکی بەرزکردنەوەی شارەزایی سەربازیی و لە ساڵی ١٩٣٠دا پلەی عەقیدی پێدرا و کرا بە موتەسەریفی پارێزگای سلێمانی، بەڵام بەر لە قەومانی شەڕەکەی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ی بەر دەرکی سەرای سلێمانی لە کارەکەی دوورخرایەوە، کەچی لە ساڵی ١٩٣١ لە دوای شەڕی شێخ مەحموود لە ئاوباریك لە دژی دەسەڵاتدارانی فەرمانڕەوایی ئێراق، ماوەیەك گیرا و تاوانی هاندانی خەڵکیان بۆ داواکردنی فەرمانڕەوایەکی کوردی خستەپاڵ و ماوەیەك بێ کارو فرمان مایەوە تاکو لە ساڵی ١٩٤٦ ئەم کەسایەتییە بەناو کورد کرا بە شالیاری ئابووری ئێراق لە شالیارییەکەی حەمدی پاچەچی داو دوای ئەوەش تاکو ساڵی ١٩٥٨ گەلێك جار بە ناوی کورد کراوە بە شالیاری بەرگری و مەعاریف.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨دا کراوە بە ئەندام لە ئەنجوومەنی پیاوماقووڵانی ئێراق «مجلس الاعیان» و لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ دا ئێراقی جێهێشتووەو چووەتە شاری لەندەن و دوا ساڵەکانی ژیانی لەوێ بەسەر بردووەو هەر خەریکی نووسینی مێژووی کورد و نووسینی بابەتی زمانەوانی کوردی بووە، تاکو لە ڕۆژی ١٩٨٤.٠١.٠٥دا لەو شارە لە تەمەنی ٩٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەی هێنراوەتەوە بۆ سلێمانی و لەسەر ڕاسپاردەی خۆی لە چیای پیرەمەگروون لە تەنیشت گۆڕی پیاوچاکی کورد پیرەمەگروون بە خاك سپێردراوە.

## بەرهەمەکان:

دوای دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد لە ساڵی ١٩٧١، تۆفیق وەهبی بە ئەندامی شانازی (فخری) هەڵبژێردرا و گەلێك لێکۆڵینەوەی دەگمەنی لە گۆڤاری کۆڕدا نووسی.

هەندێك لە بەرهەمە چاپکراوەکانی ئەمانەن:

بە کوردی:

- وتاری کوردییەکەمان بە چۆن حرووفێك و چۆن بنووسین؟ - دیاریی کوردستان، ١٩٢٥، ژمارەکانی ٥ و ٦
- دەستووری زمانی کوردی - بەغدا، ١٩٢٩، ١١٤ لاپەڕە
- خوێندەواریی باو - بەغدا ١٩٣٣، ٤٤ لاپەڕە
- قسنێك لە کوردستان - بەغدا ١٩٤٧، ١٨ لاپەڕە
- فەرهەنگی کوردی - ئینگلیزی (A Kurdish-English dictionary) - بە هاوبەشی لەگەڵ ئەدمۆندز (Cecil John Edmonds) ، لەندەن ١٩٦٥، Oxford Press، ١٧٩ لاپەڕە

بە عەرەبی:

- رجعیه المانیا و عباده القوه - بەغدا ١٩٤٢، ٣٦ لاپەڕە
- الاصل و الاستطراد فی اصل معنی بغداد - بەغدا ١٩٥٠، ٥١ لاپەڕە
- قواعد اللغه الکردیه ج (١) - بیروت ١٩٥٦، ١١٢ لاپەڕە
- قواعد اللغه الکردیه ج (٢) - بیروت ١٩٥٦، ٥٥ لاپەڕە
- التون کوبری - بەغدا ١٩٥٦، ٢٨ لاپەڕە
- سخره من دربند بازیان الی تاسلوجه - بەغدا ١٩٥٦، ٣٦ لاپەڕە
- حول مقال مسئوولیه الادیب الکردی للاستاذ عبدالمجید لطفی - بەغدا ١٩٧٣، ١٥ لاپەڕە

بە ئینگلیزی:

- ئەشکەوتی گندۆك - بەغدا ١٩٤٩
- پاشماوەی میسرازئیەکان (ئێزدییەکان) لەندەن ١٩٦٢
- خوێندنی کوردی - بەشی یەکەم لەندەن ١

هاوینی ساڵی (٢٠٠٨ز)، خەریکی ئامادەکردنی کتێبێك بووم لە بارەی ئایینی (یەزیدی)یەوە و بۆ چنگخستنی سەرچاوەش بۆ ئەم کارەم، لە ناو دەیان و دەیان سەرچاوەی هەمەجۆردا، کەڵکێکی تایبەتی و جیاوازم لە بەشی یەکەمی سەرجەمی بەرهەمی (عەرەبی)ی زانای گەورە: مامۆستا (تۆفیق وەهبی) وەرگرت، کە بنکەی (ژین)ی هەمیشە چالاك و کارامە، لە ساڵی (٢٠٠٦ز) دا بەچاپیان گەیاندبوو. بەو هۆیەشەوە کە وەك تاقانە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند و رەهەند کوردانە، پشتم پێدەبەست و چەندانجار دەگەڕامەوە سەری و بە وردی بە وشە و ڕستە و پەرەگرافەکانیدا دەچوومەوە، بۆم دەرکەوت بەدەم ئەم کارەمەوە، زۆربەی هەڵە زۆرەکانی چاپ و ناتەواوییەکانی تایپکردنەکەشم بەرچاو دەهاتن و بەچاکم زانی بۆ دەستنیشانکردنیان هێما و نیشانەیان لەسەر دابنێم و دواتریش و پاش دەستخۆشیکردنم لە برایانی بنکەی (ژین)، سەرنجەکانی خۆمیان لە بارەی ئەم هەڵە زۆرانەوە عەرزکردن، کە بە سنگێکی فراوانەوە لێمیان وەرگرت و داوایان لێکردم هەڵەچنی بەشی دووەمی سەرجەمی بەرهەمی (کوردی)ی مامۆستای ناوبراو، بە من بسپێرن و پاشانیش هەر وایان کرد و سەرلەبەری بەشی دووەمی نووسینی تایپکراویان بۆم نارد و منیش لەبەر دوو هۆ زۆر بە گرنگ و بایەخ پێدانەوە، کاتێکی زۆرم بۆ بە وردی خوێندنەوەی تەرخانکرد:

١. هەلێکی هەڵکەوت و زێڕین بوو بۆ خۆم، تا زۆرینەی بەرهەمی نووسینی ئەم زانا گەورەیە، لە یەك کاتدا و بەسەریەکەوە بخوێنمەوە، لە کاتێکدا کە پێشتر دوای ماندووبوونێکی زۆر و پچڕپچڕ، دەستم بە بەشێکی ئەم گەنجینە شاراوەیە گەیشتبوو. بۆیە چێژو زانیارییەکی بەکەڵکی دامێ و هاوکاتیش بووە مایەی ئەوەی بەهرە و سەرمەشقی شاگردانە، لە شێوازی توێژینەوەی خۆماڵییانەی ئەم نووسەرە فرە بەهرەیە وەربگرم.

٢. بۆ ئەوەی ئەم بەرهەمە بە پیتە وەك مەبەست و پەیامی مامۆستا (تۆفیق وەهبی) بە خوێنەران بگات، هەوڵم دا جگە لە هەڵەچنی، لەگەڵ هەندێ وشەدا، ڕێنووسی کوردیی ئێستا لەبەرچاو بگرم و لە زۆر شوێنی پێویستی ناو ڕستەکانیشدا، جارجارە (کاما) یان نوقتەیەك دابنێم، چونکە لە داڕشتنی چاپی یەکەمی ئەم چەپکە نووسینانەدا، کە زۆرینەیان (٧٠-٨٠) ساڵ بەر لە ئێستا و پیتچنی (عەرەب) دایانڕشتوون، بۆ خوێندنەوەی ئێستا جۆرە هەڵوێستە و تەمومژێکی دروست دەکرد. لە هەندێ جێگەشدا ئەگەر پێویستی بە ڕوونکردنەوە و سەرنج و پەراوێز هەبووبێ، وردە سەرنج و پەراوێزم بۆ کردوون، (وەك ڕاستکردنەوەی دێڕە شیعرێك، یان شتێکی لەو بابەتە) و کۆشاوم ئەو پەراوێز و سەرنجانە، زۆر کەم و کورت بن، بەڵام لەسەر بابەتێکیان، کە بەناوی (پیرەمەگروون)ەوە بوو، بەو هۆیەوە کە لەلایەکەوە: وتارەکە، بۆ خۆم چێژ و زانیاریی زۆرم لێ وەرگرت و لەلایەکی تریشەوە: نەمدەتوانی بەبێ هەڵوێستە لەسەرکردنێکی ئارام بەلایدا تێپەڕم، بۆیە هەرچیم دەکرد سەرنجەکەم لەمەی ئێستا بۆ کورتتر و چڕتر نەدەکرایەوە.

تۆفیق وەهبی و د. عەبدوڵڵا مەردۆخی

لەبەرئەوە ناچاربووم لە شێوەی پەراوێزی دەرهاوێژم و بیکەمە ئەم ڕوونکردنەوەیەی، کە ناوی (بەدواداچوون) م لێناوە و پێم چاکە بەسەربەخۆ و بۆ زیاتریش کەڵك گەیاندن بە خوێنەران، لەم وتارە بە نرخەی مامۆستا (وەهبی)، لە پێش (بەدواداچوون)ەکەی خۆم، وتارەکەی مامۆستای ناوبراو، بخەمە بەردەست و چاوی خوێنەران، ئەوسا ڕوونکردنەوەکەی خۆمی لەسەر دەردەبڕم.(١)

## پیرەمەگروون (٢)

تۆفیق وەهبی

(ئەگەر لە ملەی تاسڵوجەوە هەڵبگەڕێین بە شاخەکەی نیوەڕۆی خۆرەڵاتیدا و بچنە تەپڵەسەرێکی بەرز و ڕووبکەنە ڕۆژهەڵات، چاوتان ئەکەوێ بەکێو و شاخ و دەشتاییێ کە سروشت بە هەموو تەڕدەستیی خۆیەوە ڕازاندوویەتیەوە و ڕەنگاوڕەنگی کردووە، بە گشت ئەو ڕەنگانە کە چاو ئەگەشێننەوە و فەرەحی ئەبەخشن بە دڵ، ئەوێ بەشێکە لە نیشتمانی کورد، کە شاعیر و ئەدیبە حەیرانەکانی، بە (کوردستانی) ڕەنگین ناوی ئەبەن.

لەبەرچاوتانا، لەوێ، دەشتایێکی فراوان درێژ ئەبێتەوە لە شیمالی خۆراوەوە بۆ نیوەڕۆی خۆرەڵات، وە درێژایی خۆرەڵاتی ئەم دەشتاییە، کە ناوی (دەشتی سلێمانی) ی زۆر لێ دێ، ڕیزە دیوارێکی شاخ کشاوە موازی بە زنجیرە شاخەکەی بەرانان، کە ئەمیان دیواری خۆراوایی دەشتەکەیە.

وە ئەگەر وردتر بڕوانن، ڕاست ئاقاری خۆرەڵات لە پەراوێزی بناری شاخی گۆیژە کە یەکێکە لەو ڕیزە شاخانەی سنووری خۆرەڵاتی دەشتەکە، شارێ بەدی ئەکەن، ئەمە شاری سلێمانییە، ئەم شارەیە دڵە زیندووەکەی نیشتمانی کوردە.

ئەو ڕێگایەی لە تەنیشتی چەپمانەوە لە ملەی تاسڵوجەوە گلۆر ئەبێتەوە بۆ دۆڵی تانجەرۆ، ئەکشێ بەناو دەشتاییێکی شەپۆلدەرا بەرەو خۆرەڵات بۆ سلێمانی، کە لە پاش پەڕینەوەی ئاوی قلیاسان، بەسەر پردە تازەکەیان، ئینجا ئەگاتە جێ. سلێمانی شارێکی تازەی کوردستانە (١١٩٩/١٧٨٤) یادگاری ئیبراهیم پاشای بابانە.

وە ئەگەر چاوبگێڕن بۆ لای دەستە چەپەوە، کێوێکی بڵندی تاقانەی بەدەماغتان بەرچاو ئەکەوێ کە هێشتا لووتی بەرزە بەو خەڕۆیی دێرینییەوە، خەڕۆیی ئەو ڕۆژگارەی کە خوایێ بوو هەرێمی سلێمانیو هاوسێکانی ئەپاراست بە شاخەکانیانەوە، دۆڵ و ڕووبار و کانییەکانیانەوە، بە مرۆویانەوە، بە گیانلەبەر و کشتوکاڵیانەوە، وە ئاگاداریان بوو. ئەم کێوە بەسامە خۆشەویستە کێوی (پیرەمەگروون)ی موقەدەسی دێرینییە، کە هێشتا ئەمڕۆش موقەدەسە لە شیعر و گۆرانیی کورددا.

کێوی پیرەمەگروون، ئەبێ وەکو هەموو کێوێکی مانەندی خۆی، لە دەوری بەردا پەرسترابێ، قوربانی پێشکەش کرابێ و سوێندی بەسەر خورا بێ، هەرچەند خوایەتییەکەی لە دەوری تاریخیدا لێی داکەنراوە، بەڵام موقەدەس تەماشاکراوە.

مادەکان لە سەدەی حەوتەمی پێش میلادەوە لە ڕۆژانی جەژنەیاندا، بەوێنە، لە جەژنی سەریساڵیاندا، لە جەژنەکانی گەڕانەوەی بەهار و هاوینیاندا، لە جەژنی نۆبەرەی سەوزی پاڕانەوە بۆ باران لە پاییزدا، وە بۆ ڕزگاربوون لە بێ بارانی و نەبوونی و نەخۆشیی داگیرکەر و نەخۆشی تر، وە بۆ پاڕانەوە بۆ مناڵ بوون و نەمردن، وە بۆ پاڕانەوە بۆ دووربوون لە دوژمنی داگیرکەر، وە بۆ پیرۆزی بەسەر دوژمنا، سەر ئەکەوتنە تەوقە سەری پیرەمەگروون و قوربانییان پێشکەش ئەکرد، بەهەر گەورەی گشت خوایەکانیان (دیاوس پیتەر) واتا (باوە ئاسمان، خوا ئاسمان)، وە بە خوای نوور و پەیمان و سەرڕاستی، پارێزگاری وڵات و دێهات و کەشتگا، (میپرە)ی گەورە (میهر، کە لە پێشا بە خوای خورشید زانراوە)، وە بەبانوو خوا (الهە)،، ئەناهیتا، ناهید و خوایەکانی تریان.

نەبوخزنەسەر (بەختەنەسەر ٦٠٤-٥٦١ پێش میلاد)ی شای بابل، قولە عەجایەبەکەی بابلی لاسایی (لە ئاسایی) کێوی پیرەمەگروونی بەشکۆ، یان کێوێکی تری لووت بەرزی وەکو ئەوی، دروست کردووە بۆ دڵخۆشیی بانووشا (مەلیکە) خۆشەویستەکەی، (ئامیتیس)، کە دوێتەی شای ماد (ئەژی دەهاکە) بوو.

(ئامیتیس) ئەشێ بارەها سەر کەوتبێتە سەر ئەو کێوانە بۆ بەجێهێنانی پەرستشی خوای هەرە گەورەیان (دیاوس پیتەر) (باوە ئاسمان)و میپرە (میهر)و خوایەکانی تریان. خوای نوور و پەیمان و وەفا و سەرڕاستی بوو، بە تایبەتی خوای هەرە خۆشەویستیی مادەکان بوو.

لام وایە هەتا دوایی سەردەمی ساسانی پەرستگاییێکی ئاگر بووبێ لە چەشنی (چوارتاق)، لە تەپڵەسەری کێوی پیرەمەگروون، بێگومان لە زۆر دوورەوە دیاربووە. ئەشێ لەسەر کێوی (سەرسیر)یش چوارتاقێك بووبێ، کە ناوی

تۆفیق وەهبی

بەدییەکەی (چوارتا)وە ماوەتەوە.(٣)
بانوو خوا (الهە) ئەناهیتا لە سووری ساسانیدا (بانۆك ناو)، واتا (خانم ناو) یاد ئەکرا، ئەشێ کە پەرستشگاییێکی (بانۆك ناو٩ بووبێ لە سەرچاوەکەی پیرەمەگروون. سەرچاوەکە هەر خۆی بانووخوا (ئاناهیتا) بوو، ئەیانپەرست.
(ئەناهیتا) بانوو خوای سەرچاوە و ڕووبار و پیت و بەرەکەتی سەر زەوی و هی زاوزێ بوو. بوژاندنەوەی کانیەکان و زیادبوونی ئاو، تەجەلیی ئەو بوو، پیت و بەرەکەتی بەخش ئەکرد بە زەوی، وە مێرد و منالّی ئەدا بە کانیەکان، وە بانوو خوای پیرۆزیش بوو.
لەوەی هەتا ئێستا بەیانمان کرد وا دەرئەکەوێ کە پیرەمەگروون دەمی خۆی پەرستراوە، دەمێ بۆتە پەرستشگا بۆ پەرستنی ئاسمان و ئاسمانیەکان و دەمێ بۆ ئاگر، ئاو، لە دەوری ئیسلامیدا بۆتە جێی مەرقەدی شەخس و پیر، کەوا ئێستا مەرقەدی پیرەمەگروونی لێیە.
پیرەمەگروون کەوا دیارە، یەکێ بووبێ لە پیرەکانی ئسماعیلیی کۆن، مەرقەدەکەی لەبن قولەی کێوەکەدایە، ژنان ئەچنە سەری، قوربانی بۆ سەر ئەبرن، داوای زگ پڕبوونی لێ ئەکەن. ئەم شەخسە یەکێکە لەوانە کە حاجەتی ناومالّی، کە وەکو مەنجەلّ و کاسە و کەوچك و شتی تر بێ، بە نیاز بۆ ئەبرێ و لای دائەنرێ.
ئەشێ ئەسلّی ناوەکەی (پیرعەنبەر گودروون) (گوردووە) بووبێ. پار لەسەردانی دوایی پیرەمەگروونمدا، لە دێی (زێویە) پێیان وتم کە پیرەمەگروون یەکێکە لە ئەسحابەکان، دیارە ئەوان ڕاست ئەکەن.
ئەو دێیە کە ئێستا ناوی (زێویە)یە، هەمیشە ئاوا بووە، وە جێگای ئاگرەوان، موگ و هێربەدەکان بووە کە پیاوی دینیی زەردەشتی بوون. (زێویە) بە پێی ناوەکەیەوە وا دیارە کە لە دەوری ئیسلامیشدا سەردەمێك ناوچەیێکی تەریقەتێ بووبێ، وە (زاویە) (تەکیە)یێکی لێ بووبێ.)

* * *

وەك سەرنجمان دا مامۆستا تۆفیق وەهبی لەم چەند لاپەڕە زۆر کەمەدا (کە لە بارەی دێرینەی چیای پیرەمەگروونەوەیە)، ئەو هەموو زانیارییە مێژووییە دەوڵەمەندەمان بەو خێراییە زۆر هوشیار و زیرەکانەیە بۆ بەسەر دەکاتەوە و دەمانباتەوە بۆ ئەو سەردەمانەی کە ئەم چیایە و ئاقارەکەی لە سەدان و هەزاران ساڵ لە پێشترەوە، مەڵبەندی ئایینی دانیشتووانی ناوچەکە بەگشتی و بەتایبەتیش لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی دەوڵەتی (ماد-سەدەی حەوتەمی پێش زایین)دا، مەڵبەندێکی ڕێبەرانی ئایینی (ماد) بووە و ڕێوڕەسمی ئایینییان تێدا ئەنجامداوە و لە تەکیشیدا کە دێتە سەر ناوی گوندی (زێویە) ی ناوجەرگە و ئامێزی چیاکە، بە هەمان شێوە لەم گوندەش دەدوێ و ئەم گوندەش بە دێرینەی چیاکەوە دەبەستێتەوە و دەڵێ: (ئەم دێیە، کە ئێستا ناوی ـزێویەـ یە، هەمیشە ئاوابووە و جێگەی ـئاگرەوان-و-موگ-و-هێربەد-ەکان بووە، کە پیاوانی ئایینی زەرتوشتی بوون).. کەچی کە ڕاڤەی وشە و ناوی گوندی (زێویە) دەکات، دەڵێ: وا دیارە لە سەردەمی (ئیسلامی)شدا، ناوچەیەکی تەریقەتێ بووبێ و (زاویە): تەکیە-یەکی لێ بووبێ!!. کە وەك دیارە مامۆستا وەهبی وشەی (زێویە)ی بە وشەی (زاویە)ی عەرەبی لێکداوەتەوە، بۆیە ناوی (زاویە) بۆ ڕۆژگاری ئیسلامی دەگێڕێتەوە!
بۆیە کاتێك بەپێ و شوێنی بەسەرکردنەوەکەی مامۆستا (تۆفیق وەهبی)دا دەچینەوە، کە دەڵێ: گوندی زێویە، جێگەی ئاگرەوان-موگ-و- هێربە-ەکان بووە، بێ هیچ دوودڵییەك ئەمەی لەگەڵدا دەسەلمێنین و بۆ پشتیوانیکردنی ئەم بۆچوونەیشی، ئەوە بەیاد دێنینەوە، کە هەر لە سەرووتری ئەودیوی چیای پیرەمەگروونەوە، ڕیزە چیایەکی تری بەرز و زۆر سەخت و ڕەقەن بە ناوی چیای (ژیلوان)ەوە هەیە، کە لەگەڵ زنجیرە چیایەکی تردا بەسەر گوندی (چۆخماخ)ی سەر بە دۆڵی (جافایەتی)دا دەڕوانن.
چیای (ژیلوان) هەر لە ناوەکەیەوە بیرمان بۆ ئەوە دەبات کە ئەم چیایە بە درێژایی ساڵانێکی زۆر (ئەگەر نەڵێم چەند سەدەیەکیش) جێگەی (ئاگرەوان=ژیلەوان) بووە، چونکە تا ئێستاش شوێنەواری ئاگری گەورە و کورەی گەورەی ئاگر بەسەر هەموو ڕووخساری ڕەشداگەڕاوی چیاکە و تاتەبەردە ڕەشەکانییەوە دیارە و دەریش دەکەوێ، کە لە ئاکام و بەهۆی ئەو تەمەنە درێژەی ئەو ئاگرەی لە سەرتاسەری ئەم چیایە و ئاقارەکەیدا هەبووە، شوێنەواری درەخت و سەوزایی لێ نییە.
من لە دوو قۆناغی ژیانی پێشمەرگایەتیمدا (١٩٧٤-١٩٧٥) و (١٩٨٠-١٩٨٧) ڕۆژگارێکی زۆرم لە نزیك هەردوو چیای پیرەمەگروون و چیای (ژیلوان)دا، بەسەربردووە، بە تایبەتی ساڵانی (١٩٨٦-١٩٨٧)، کە بەماڵەوە لە گوندی (مێولاکە)ی نزیك (چۆخماخ) ی دامێنی چیای (ژیلوان) بووین، زۆرجار هەستێکی قووڵی پڕ لە ڕامان پاڵی پێوە دەنام بە چیای (ژیلوان)

دا هەڵگەڕێم و لە دیمەنی ڕەش و هەڵکەوتی سامناکی چیاکە ورد ببمەوە! سەیر لەمەدایە هەر لە تەنیشت چیای (ژیلوان)ەوە، چیایەکی تر بە ناوی چیای (ئاسنگەران) هەیە و شێوە و هەڵکەوتی ئەم چیایەش وێکچووی چیای (ژیلوان)ە، وەك بە ناوەکەی ئەمیشدا دیارە، ئەم چیایە تایبەت بووە بەپیشەگەرانی (ئاسن)، بۆ دروستکردنی کەرەسە و چەکی جەنگیی، بۆ سەربازان و جەنگاوەرانی سوپایی سەردەمانی پێش هاتنی لەشکر و ئاینی ئیسلام بۆ ناوچەکە.

مێژووی (ناو)ی چیای (ژیلوان)، کە بێ هیچ سێ و دوویەك، گومان لە کوردی بوونی (ژیلوان=ژیلەوان) ناکرێ، دەبێ بۆ سەدان ساڵی بەر لە هاتنی دەسەڵاتی عوسمانی بۆ ناوچەکە بێت، چونکە کە دەسەڵاتی عوسمانی دەستیان بەسەر ناوچەکەدا پەیداکردووەو وەك ڕەوشت و نەریتی هەموو داگیرکارانێك، کە پێش هەموو شتێك ناوە دێرین و ڕەسەن و کۆنەکانی ناوچەکەیان بۆ زمانی خۆیان (تورکی) گۆڕیوە، هاتوون هەر بە پێودانی ناوی چیای (ژیلوان)، ناوی ئەو گوندەش، کە لە دامێنی چیای (ژیلوان)دایە، بە(چۆخماخ = چۆقماق = چەقماق) ناوناوە، کە هەر بە مانای ئاگر و ژیلەمۆ دێت(٤).، بەڵام ئەم ناولێنانە (چۆخماخ)، تەمەن نزیکەی (٤٠٠-٥٠٠) ساڵەی عوسمانی، نەك هەر نەیتوانیوە ناوە دێرینەکەی چیای ژیلوان بسڕێتەوە و لەبیر خەڵکی بباتەوە، بەڵکو لە هەمانکاتدا ناوی (ژیلوان) نهێنییەکی دێرینەی زمانی کوردی ئاشکرا دەکات، کە کورد لە سەدان ساڵ پێشترەوە لە جیاتی وشەکانی (موبەد، ئاتوروان، ئاسوروان)ی پێڕەوانی ئاینی زەرتوشتی، کە بە کوردی (ئاگرەوان) دەگرێتەوە، وشەی (ژیلوان) یان بەکارهێناوە. هەر لەم ڕەهەندەشەوە بیر بۆ ئەوە دەچێ، کە دوای هاتنی دەسەڵاتی ئیسلام بۆ کوردستانو بۆ ڕازیکردنی دەسەڵاتدارانی ئیسلام، لە ناوچەکەدا، لە بری وشەی (موبەد)و (ئاتوروان)، وشەی (ژیلوان)یان بەکارهێنابێ.

هەر وەك چۆن لە وڵاتی ئێرانیشدا (سەردەمی ساسانی)، بۆ هەمان مەبەستی دڵنەواییکردنی فەرماندەکانی ئیسلام، لەبری وشەگەلی ئاینی زەرتوشتی وەك: ئیزەد، موگ، موبەد، وشەکانی: یەزدان، هیربەد و مەلەك (فریشتە) یان بەکاربرد.

دەگەڕێمەوە بۆ سەر ناوی (زێویە)و دەڵێم: مێژووی ناوی (زێویە)، لە مێژووی هاتنی ئیسلام کۆنترە و ئەگەر مامۆستا تۆفیق وەهبی لە گوندی (زێویە)ی لای چیای پیرەمەگروونددا شوێنەواری ئاینی ئیسلامی دیبێ، ئەمە شتێکی ئاساییە و نەریت و ڕەوشتی هەموو ئاڵوگۆڕێکی ڕۆژگار و لەناوچوونی دەسەڵاتی کۆن و پەیدابوونی دەسەڵاتدارانی تازە و ئاینی نوێ، ئاڵوگۆڕی هەمەلایەنەش بەدوای خۆیاندا دێنن، بۆ نموونە: دەسەڵاتدارانی تازە هاتوو، لە شوێن دەسەڵاتدارانی پێشوو دادەنرێن و ئاینی تازەش، جێگەی ئاینی کۆن دەگرێتەوە. لەم بوارەدا چەند نموونەیەك بۆ بیرخستنەوە بەیاد دێنینەوە:

خشایارشا (٥٦٥-٤٨٥پ. ز) ی هەخامەنشی، کاتێ بڕوای بە ئاینی (زەرتوش) هێنا، هێرش و لەشکرکێشیی کردە سەر پەرستگە و مەڵبەندەکانی ئاینی (موغ-موگ)ەکانی (ماد) و تێکیدان و داوای لە دانیشتوانی قەڵەمڕەوەکەی کرد لە شوێن و جێگەی ئەو پەرستگایانەی (موگ) پەرستگەی (زەرتوشی) دروست بکەنەوە.. یان کاتێ (هۆلاکۆ ١٢١٧-١٢٦٥ز) هێرشی بۆ سەر ئێران کرد و داگیری کرد لە

ناوجەرگەی هەندێ پەرستگەی زەرتوشتیدا، مزگەوتی دروستکرد، وەك لە ناو پەرستگەی گەورە و بەناوبانگی (ئازەر گشنسب=شیز)دا، مزگەوتی گەورەی بۆ خواپەرستیی پێڕەوانی ئایینی ئیسلام دروستکرد، بەڵام بەم کارە، ناوی دێرینەی پەرستگەی (ئازەرگشنسب) لەیاد نەچوو..کە لەم ڕووەوە دەیان و سەدان نموونەی لەمجۆرە هەن.. بۆیە بوونی شوێنەواری ئیسلامی لە گوندی (زێویە)دا مانای ئەوە ناگەیەنێ، کە بەهاتنی ئایینی ئیسلام بۆ دۆڵی جافایەتی، ناوی گوندی (زێویە) ش لە ناوچووبێ، هەروەك نموونەی چیای (ژیلوان) ی پێشتر باسکراو، کە وشەو ناوی (چۆخماخ)ی تورکی نەیتوانی ناوە دێرینەکەی (ژیلوان) لەبیر خەڵکی ناوچەکە بباتەوە.. هەر لەبەر ئەمەشە بە دڵنیاییەوە دەڵێین: ناوی (زێویە) بە ناوی (زاویە)ی عەرەبییەوە نەهاتووە. بەڵگەشمان لەسەر ئەم پێداگرییەمان لەوێوە دێت، کە هەر لە کوردستاندا دەیان گوند و شوێنی تر بە هەمان ناوی (زێوێ، زێوکە، زێوە، زێویە)وە هەن، کە هەموویان لە ڕووی ناوەوە لە بنجدا یەکن و لە هەموو ئەم گوندانەشدا، هاوشێوەی گوندی (زێویە)ی لای چیای پیرەمەگروون، (مزگەوت)یان تێدایە، وەك ئەم مشتە نموونەیە:

-زێوێ-ی لای ڕاژان (ناوچەی مەرگەوەڕ).
-زێویە-و- زێوکە-ی لای شاری (شنۆ).
-زێویە-ی کۆنە لاجان (لای شاری خانێ).
-زێویە-ی سەر بەدێستانی (مەنکاریی)ی سەردەشت، کە بە سێوە لاسوورە بەناوبانگە.
-زێوە-و بەر زێوە-ی ناوچەی باڵەکایەتی.
-زێوە-و-دەرە زێوە-ی ناوچەی خۆشناوەتی.
-زێوێ-ی ناو شاری کەرکووك.
-زێوە مەڕ-ی ناوچەی قەرەداخ.
-زێوێ-ی شێخ پیرمووس (تەنیشت بامەڕنێ).
-زێوکە-ی سەر بە ناحیەی نەهلێ (نەهلە)ی پارێزگەی مووسڵ.
-زێوە-ی سەر بە ناحیەی نەهلێ- مووسڵ.
-زێوە-ی سەیدا، سەر بە ناحیەی نێروە و ڕێکان.
-زێوێ-ی شکان سەر بە ناحیەی نێوە و ڕێکان (قەزای ئامێدی).
-زێوکاشین-ی سەر بە قەزای ئامێدی.
-زێوکاژیری- سەر بە قەزای ئامێدی.
-زێوا-ی شەفیقێ- سەر بە قەزای دهۆك.
-زێوکا-ی سەر بە ناحیەی نێروە و ڕێکان.
-زێوا-ی سەرێ، سەر بە ناحیەی نێروە و ڕێکان.
-زێوە-ی سەر بە ناحیەی دیانا.
-زێوکە-ی سەر بە ناحیەی ناودەشت.
-زێوە-ی ناوچەی نزار لە بارزان (سەر بە قەزای ئاکرێ).
-زێوکە-ی کەنداڵان (ناوچەی دۆسکی).
-زێوکا عەبوی (ناوچەی دۆسکی).
-زێوکە-ی محەمەد یاسین (ناوچەی دۆسکی).
-زێوە-ی سەر بە ناحیەی زاوێتە.
-زێوکێ-ی جیسك (سەر بە ناحیەی گولی).
-زێوکا-ی سندیای (سەر بە ناحیەی گولی).
-زێوە پیرامیس-ی سەر بە ناحیەی سەرسەنگ.
-زێوە-ی سەر بە قەزای ڕانیە.
-زێویە-ی سەر بە قەزای شارباژێر.
-زێوە-ی سەر بە دێستانی دۆڵ.
-زێوە-ی سەر بە دێستانی گەورك-نەڵێن.
-زێوە-ی سەر بە دێستانی ملکاوی.
-زێوە-ی سەر بە دێستانی مەنگوڕی خۆرهەڵات.
-زێوێ-ی سەر بە دێستانی (ئێل تیمور)ی بەشی ناوخۆی مەهاباد.
-زێوەگەورە-ی سەر بە دێستانی (سوگمان ئاوا)ی دەوروبەری شاری (خۆی).
-زێوە-ی سەر بە دێستانی (فارسینجی)ی سەر بە (ئەسەدئاوا) ی پارێزگەی هەمەدان.
-زێویە-ی سەر بە دێستانی (بیلەوەر)ی بەشی (کامیاران) ی سەر بە پارێزگەی ـسنە —کوردستان).
-زێویە—ی سەر بە دێستانی (ئیسفەندئاوا) ی سەر بە شاری (قوروە) ی پارێزگەی (سنە-کوردستان).
-زێویە-ی سەر بە دێستانی ژاوەرۆری هەورامانی تەخت.
-زێویە—ی سەر بە دێستانی (نەمەشیر) ی شاری (بانە).
-زێویە—ی سەر بە دێستانی (گوڵ تەپە)ی ناوچەی فەیزوڵڵا بەگی — دەڤەری شاری (سەقز)(٥).

کە لە ناو ئەم لیستە ناوەدا و ئەوەی زۆرتر لە مەبەستەکەی ئێمەوە نزیکە، ئەم دواناوە، واتە: (زێویە) ی دەڤەری شاری سەقزە، لە خۆرهەڵاتی کوردستان، کە نزیکەی (٥٠ کیلۆمەتر) دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی سەقز و بە هەمان شێوەی ناوچەی دۆڵی جافایەتیش، شەقڵ و مۆرکی ـگوڵ تەپە) ی تورکی، بەسەر ناوچەکەوەیە.

دانیشتوانی ئەم گوندە کوردن، کاریان کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنە، کەشوهەوای زۆزان و ساردە سێرە و جێگەیەکی ئاوێژە و بە بڕشتە. وەك هەر

گوندێکی تر، قوتابخانه و مزگەوتی تێدایە. ساڵی (١٩٦٣) شوێنەوارناس و دێرینە زان، کۆڵیاریی و پشکنینیان تێدا کرد. دێرینە و شوێنەواری شارێکی کۆنی تێدا دۆزرایەوە و گەلێ شتومەکی تێدا چنگ کەوت، کە نیشانەی پێشکەوتنی هونەری و وردەکاری و پیشەیی و خوێندەواری بوون. ئەم گوندە لە بنەڕەتدا ناوی (زێبیە) بووە کە لەگەڵ ناوی ئێستایدا زۆر لە یەکەوە نزیکن و گوایە ئەم ناوانە، لەو بەردە نووسە مێژووییانەدا نووسراون، کە سارگۆنی دووەمی ئاشووری (٧٢٢-٧٠٥ پ.ز) و ناسراو بە (شروکین)ی ئیمپراتۆری ئاشووری، ئەم باسانەی لە ساڵی شەشەمی پاشایەتیی خۆیدا یاداشت کردووە و نووسیویە: (شاری ئیزیرتو) ی وێران کردو سووتاند و دووشاری تری (زێبیە) و (ئارمانیدیش) یشی داگیر کردووە، هەر ئەم (سارگۆن)ە دواتر لە بەردەنووسێکدا ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە، کە دوای داگیرکردن، ئەم دوو شارەی (زێبیە) و (ئارمانیدش)ەی سووتاندووون.

لە ئاکامی ئەو کۆڵیاری و پشکنینانەی لەم گوندەدا کران، گەلێ خشڵ و کەرەسەی زێڕینی تێدا دۆزرایەوە. هەندێ لەو شتانەی تێیدا دۆزرایەوە: سینەبەند و گەردنبەندێکی لە زێڕ دروستکراوی هەڵقەهەڵقەیی بوو. کە هەردووکیان بە وێنەی کەللەسەری جانەوەرانی وەکو: شێر، دێو، دەعبا و دڕندەی نەناسراوی ئەفسانەیی نەخشێنرابوون. هەروەها کالانی خەنجەر و نێزە و پەیکان و چەکی تری جەنگیی. دیوارەکانی کە لە ژێر زەویدا دەرهێنراون، زۆر سەختن، پلیکانەی بە تاتەبەردی تاشراوی لووس و نەخشی سوورەوەکراوی قاڵب زل دروستکراون. هەندێ لە ژوورەکانی ئەم تەلار سازییەی، بە داری (سەروو) دارەڕا کراون، کە داری (سەروو- سەوڵ)، ئێستا لەو دەڤەرانەدا نابینرێن. دیوارەکانی بە کاشی سوورەوەکراوی ڕەنگاوڕەنگ نەخشێنراون.

بە پێی لێکۆڵینەوەی دێرینەناسان، ئەم شتانە هەموو، پاشماوەی سەدەی نۆیەمی پێش زایینن. کە دەبێ لێرەدا لە یادمان بێ، لە سەردەمی نۆیەمی زاییندا، دەوڵەتی (مانا)، یان (ماندی) دەسەڵاتی بەسەر ئەم هەرێمانەدا هەبووە و یەکێك بووە لە دەستە دەوڵەتەکانی (زاگرۆس)، کە بەر لە ئیمپراتۆریەتی (ماد)، لای باشووری زەریاچەی (ورمێ)، فەرمانڕەوایەتی کردووە. بەم پێیە، شاری (زێویە = زێبیە) و ئەو شارانەی کە (سارگۆنی ئاشووری)، لەم هەرێمانەدا داگیری کردوون. لە شارەکانی دەوڵەتی مانا بوون .

ئێستا ئیتر پرسیاریتر دێنە ئاراوە:

١.ئاخۆ ئەو گوند و شوێنانەی ناویان (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە) یە، شوێنەواری ناو قەڵەمڕەوەی هەمان شارستانێتی (مانا) ین!؟

٢.ئاخۆ ناوی (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە) ناوی سەردەمانی پێش ئیمپراتۆریەتی (ماد) ن؟!

٣.ئاخۆ هیچ گوند و جێگەیەکیتر لە کوردستاندا، ئەوەندەی ناوی (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە) بەم ژمارە زۆرە دووپات بوونەتەوە و هەن؟!

٤.ئاخۆ بنەما و ناوی (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە) چی بێ و لە بنەڕەتدا چۆن بووبێ؟!

٥.ئاخۆ ناوی ئەم هەموو گوند و جێگایانەی ناویان (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە)یە، لە وشە و ناوی (زاویە) ی عەرەبییەوە هاتوون؟.

## پەراوێزەکان:

١.نووسینەکەی مامۆستا (وەهبی) بە هەمان شێواز نووسراوە، کە نیوسەدە لەمەوبەر، لەگۆڤاری (پێشکەوتن) ژمارە (٨)، ساڵی یەکەم، نیسانی ١٩٥٨، ل١-٤دا، بڵاوی کردۆتەوە.

٢.پێشکەوتن (گۆڤار)، ژمارە ٨، ساڵی یەکەم، نیسان ١٩٥٨، ل١-٤، بە قەڵەمی مامۆستا بڵاوکراوەتەوە.

٣.لە بارەی (سەرسیر)و (چوارتا)وە وتارێکم نووسیوە لەبەرەوە بڵاوی ئەکەمەوە، لە ساڵی ١٩٤٥دا لە سلێمانی بۆ یەکەمجار لێبوونەوەی ناوی (سەرسیر) م بڵاوکردبووەوە، وە وتبووم کە لە (سەردسیر)ی فارسییەوە هاتووە، کە مانای (هاوینەهەوار)ە.

٤.هەر لە شێوەی ئەم ناوە تورکییانەی عوسمانی، لە هەمان ناوچەدا، ناوی گوندی (یاخ سەمەر) و (قزلەر) و چەندان گوندی هاوسێی (چۆخماخ) هەن.

٥. بۆ بەسەر کردنەوەی ناوی (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە) سەیری ئەم سەرچاوانەش کراون:

١.فرهنگ دهخدا، جلد٩،ص ١٣١١٩.

ب.محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، وڵاتەکەت باشتر بناسە. چاپەمەنی ئاراس: ٢٠٠٥، هەولێر،ل. ٣١٠-٣١٣.

ج. د. غەفوور عەبدوڵڵا، گوندەکانی کوردستان، بەرگی: ١،٢،٣،٤، هەولێر، ٢٠٠٥

د. د. غەفوور عەبدوڵڵا، فەرهەنگی جوگرافیایی کوردستان، چاپەمەنی موکریانی، ٢٠٠٨، هەولێر.

## پێشەکی:

لە ڕۆژگارێك دا سەردەمی لاوێتیم بەخۆمەوە دی، بیروڕای دەروون و مێشك سرکەری وا لە ناوەوە بوو، هەر چەندە ئێستا ئەو کاتەم دێتەوە یاد، خۆم بە خۆم پێدەکەنم. ئێمە وامان دەزانی ئەوەی وەکو ئێمە بیرنەکاتەوە ئادەمیزادێکە تەواو نییە، کەموکووڕیی هەیە؛ خۆمان ماندوو نەدەکرد، ورد نەدەبووینەوە، بە قووڵیی سەرنجمان نەدەدایە ڕووداو، نەمان دەویست بیر لە ماوەی نێوان ئادەمیزادی نیاندرتاڵ (چل و پێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا) و پەیدابوونی کارل مارکس بکەینەوە، پرسیارمان لە خۆمان نەدەکرد، ئایا لەم ماوەیەدا سڤیلیزاسیۆن هەبوو یا نا؟! کوردایەتیمان لەگەڵ هەڵسوکەوتی ڕۆژگار و سەردەم ڕێك نەدەکەوت، بەڵام وێنەی لە دڵ و دەروونمان دا نەخشی کێشابوو و نەدەچووەوە.

زۆربەی خەڵکەکە لە دژی ئینگلیز بوو، چونکە هەندێك تورکی عوسمانییان خۆش دەویست، ئینگلیز و تورکیش ڕێك نەبوون، برێکیش ئەڵمانیان خۆش دەویست، چونکە لە دژی ئینگلیز بوو. لەپاش جەنگی دووەمەوە پێوانە و ترازوو گۆڕرا، یا دەبوو ئینگلیزت خۆش بوێت، یان سۆڤیەت (ڕووس). ئەگەر لاتەریکیش بوویتایە، ئەوا هیچ حسێبێکت بۆ نەدەکرا، هەر کەسێکیش بیویستایە و نەیویستایە بەپێی هەڵوێست و خوو و ڕەوشت و بیروباوەڕی ڕۆژانەی، یا بە ئینگلیز پەرست دەژمێررا یا بە سۆڤیەت پەرست، لە دواییدا ئەمەریکا بوو بە هاوبەش یا جێگری ئینگلیز. ئیتر دوو زاراوەی «کۆنەپەرست = رجعی» و «پێشکەوتنخواز = تقدمی» کەوتە ناوەوە. کاری هەرە قورسیش دۆزینەوەی بابایەك بوو کە لە یەکێ لەمانە نەبێ!

لە پاش ئازادبوونم لە بەندیخانە، لە ناوەڕاستی تەمووزی ١٩٤٩، کەوتمە هێنانەدی هەموو ئەو ئەنجامە ڕاستییانەی گەیشتبوومێ بۆ دیاریکردنی هەڵوێستم لە ژیان دا لە ڕووی کارکردن لەناو پارتی و ڕێکخراوێك، یان لە دەرەوەی ئەمانە، تا پلەیێك خۆم ناسییەوە، یا خۆم دۆزییەوە. دەبێ بۆ ڕاستییش ئەوە بڵێم ئەو ماوە کەمەی کە بە تەواوی بریتییە لە دوو مانگ و بیست و یەك ڕۆژی دەرەوەی بەندیخانە و شەش مانگی ناو بەندنخانە، ڕۆژگارێکی نا ئاسایی بوو لە ژیانم دا. چەپ ڕەوییەکی نامەنتیقییانە بوو، نە لەگەڵ بیر و باوەڕی قووڵ و داهێنان ڕێك دەکەوت و نە بۆ ڕەوشت و ژیانی ڕۆژانەشم دەستی دەدا. هەر لەو سەردەمە هەرزەییەدا بۆم دەرکەوت کە ناتوانم بیر و هۆش و مێشکم بدەم بە هیچ کەسێك. ئیتر ئازایانە ئەگەر گەورە و مەزنێکی وەکو تۆفیق وەهبی بیوتایە:

مارف! دەمووت: بەڵێ!

چاو و گوێی دەسەڵاتی ئەو سەردەمە، زۆرباش دەیانزانی یەکێکی وەك من جڵەوی ئەسپی بەدەست خۆیەتی و لەناو هیچ ڕێکخراوێك دا نییە، بەڵام ترسی زۆری ئەو دەسەڵاتە لە بیر و باوەڕی کوردایەتی بوو، کەچی چەپ ڕەوەکان بە هەڵە وایان دەردەبڕی کە ترس تەنیا لە «سوسیالیزم»و «کوردایەتی» لەناو خۆی دا تواندۆتەوە. ئیتر دەسەڵات بۆ بەربەرەکانی گیانی کوردایەتی خوێندەواری کوردی بەناوی هەڵگری «ئیدیۆلۆجی سوسیالیزمی» تاوانبار دەکرد. من لە ڕۆژنامەی «هەولێر = آربیل» لەسەر ئەدەبی کوردی و خوێندەواریی کوردم دەنووسی، ئەمە بووە هۆی تووڕەیی هەندێ لە هەتیوەکانی دەسەڵاتی عوسمانی ڕزیو و چەند بێگانەیەکی دوور لە کۆمەڵی هەولێر. وا بوو وەزیفە بچووکەکەی کارگێڕیی زانیاریم گوێزرایەوە شاری کوت لە خوارووی عێراق. بێگومان ئەگەر مانم بگرتایە و بەرەو کووت -یش نەچوومایە، لە وەزیفەی میری دوور دەخرامەوە و هەر کووت -یش دەبوو بە مەڵبەندی تازەی ئاوارەییم بە فەرمانی دەسەڵات.

ساڵێکی تەواو لە «کووت» ژیانم بردەسەر، بەڵام هەستم بە ئاوارەیی نەدەکرد. ڕەفیق حیلمی کارگێڕی زانیاری بوو لە شاری عەمارە، پەیتا پەیتا تەلەفۆنی بۆ کاربەدەستانی کووت دەکرد کە ئاگایان لێم بێ، لەنامە جوانەکانی جەمیلی ڕۆژبەیانی بێ بەش نەبووم، ئابوونەی «ژین»م هەبوو گۆران بۆی ڕەوانە دەکردم، نووری سدیق شاوێس و ناهیدە شێخ سەلام لەوێ بوون و یەکتریمان دەدی، پارەم بە پۆستە بۆ کڕینی کتێبی کوردی دەنارده بەغدا، بەم جۆرە مێژووی ئەدەبی کوردیم چنگ کەوت، لە پاشانا کە عەلائەدین سەجادیم ناسی وتی: ئەوە یەك بە پۆستە پارەم بۆ بێ و داوای کتێبم لێ بکرێ.

نامەکانی جەمیلی ڕۆژبەیانی کە بۆ کووت بۆی ڕەوانە دەکردم، زیاتر ئەوەیان بۆ ڕوون دەکردمەوە کە تۆفیق

وەهبی چەند جارێك لەمنی پرسیوە، لەڕێی ئەو وتارانەی بە کوردی و عەرەبی لە ڕۆژنامەی «هەولێر» بڵاوم دەکردنەوە منی ناسیوەو نووسینەکانمی بە دڵ بووە، لەبەرئەوە بە کوڵ ئارەزوو دەکات چاوی پێم بکەوێ.

بەم جۆرە بەغدا تەنیا لەبەر خوێندنی زانستگا نەبوو بە پەرستگا بۆ من، بەڵکو ڕۆژنامەگەری و چاپەمەنی و تۆفیق وەهبی و گەلێ شتی تریش، ئەمانە هەموویان لە بەغدا نەبوایە لەجێی تر چنگ نەدەکەوتن.

ئەگەر ڕەفیق حیلمی هەوڵ و تەقەلای نەدابایە، وەزیفەی میرییەکەم لە کووتەوە نە دەگوێزرایەوە بۆ بەغدا، بەڵام وەرگرتنم لە کۆلێجی ئەدەبیاتی بەغدا بە کۆششی خۆم بوو. کۆمەڵی کۆلیجی ئەدەبیات گێتییەکی تازەی بۆ ژیانی بەغدام دروست کرد، ناسینی بەدر شاکیر سەییاب و حوسێن مەردان و عەبدولقادر ڕەشید ئەلناسڕی و جەواهیری و عەبدولڕەزاق عەبدولواحید و عەبدولوەهاب بەیاتی و هی تر، ئاسۆی بیریان فراوان کردم. ئەنجامی مەشقی ڕۆژنامەگەری لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی «هەولێر» لە لاپەڕەی ڕۆژنامە عەرەبییەکانی بەغدا خۆی نواند، لە نزیکەوە شارەزایی پەیداکردن لە چاپ و چاپخانە، بەتایبەتی چاپی ئەو کتێبانەی لە لایەن منەوە سەرپەرشتیی چاپیان کرابوو لە ماوەی چوار ساڵ خوێندن لە کۆلێجی ئەدەبیات، ئەمە هەمووی قۆناغی گواستنەوە بوو لەژیانی من دا.

## بینینی تۆفیق وەهبی

بەڵام لە هەمووی گرنگتر ناسینی تۆفیق وەهبی بوو. ئەوەی ڕاستی بێ مووچڕکێکی یەکجار نەرم و سووك بە دەروونم دا هات کە بڕیاری دواییم دا ئارەزووی تۆفیق وەهبی بێنمەدی، بەوەی بچم خۆمی پێ بناسێنم و ببم بە قوتابی ئاشنای ماوەی ژیانی کۆلیجی ئەدەبیاتی بەغدام و لە پاشانا بە هاوڕێی هەمیشەیی، ئینجا مام و برازا وەکو خۆی دەیووت. مووچڕکەکە لەبەرئەوە بوو، چونکە تۆفیق وەهبی بە کۆنەپەرست (رجعی) لە لایەن هەندێ کەسەوە ناسرا بوو، وەکو کەسێکی سەر بە ئینگلیز لە قەڵەم درابوو، بەڵام زوو بە زوو ئەم گرێیەش لە دەروونم دا کرایەوە و خۆم بە پیاو چاك و ڕاستی پەرست هاتە بەرچاو، لە دواییدا بۆم دەرکەوت کە کارێکی باشم کردووە، مێژووش ئەمەی ڕوون و ئاشکرا کردەوە، ئەوانەی تۆفیق وەهبی - یان بە کۆنەپەرست لە قەڵەم دەدا با درەنگتریش بێ، ئەوەی من لە سەرەتای پەنجاکانا کردم، ئەوان لەپاش ماوەیەکی زۆر کردیان، ئەمە جێگەی بەختیاریی گیانی بوو بۆ من.

جەمیل ڕۆژبەیانی مامۆستا و هاوڕێ و دۆستی دێرینی بنەماڵە، لە تشرینی یەکەمی ساڵی **١٩٥٣** لە بەغدا بوو، بێگومان بەڵێنی بە تۆفیق وەهبی دابوو پێی وتبوو کە من گوێزراوەمەتەوە بەغداو لە کۆلێجی ئەدەبیات وەرگیراوم و بە زووترین کات بە یەکتریمان دەناسێنی. سەردەمی پایزی جوانی بەغدا بوو، ڕۆژ تازە ئاوا بوو بوو، بۆنی شەونم هەموو لایێکی گەڕەکی وەزیریەی هێمنی گوڵاوپڕژێن کرد بوو، ڕووناکیی کزی بەر دەرگای باڵەخانە و پەنجەرەکان، لەگەڵ ئاوازی مۆسیقای نەرم و نیان دەستیان لە مل یەکتری کرد، بوو و هارمۆنیایەکی ڕۆمانتیکییانەیان دروست کرد بوو. لە دەرگای ماڵە گەورە چووینە ژوورەوە. مام نەجمی بەساڵاچووی پیاوی تۆفیق وەهبی بەگ، پۆشتەی شەڕواڵ و مرادخانی، پێشوازییەکی گەرمی کردین. نەجم لەگەڵ هەموو کەسێك دا بە کوردی قسەی دەکرد، لەگەڵ ئەوەی زمانی عەرەبیشی دەزانی، بەڵام عەرەبییەکەی فۆنێتیك ئامێزێکی کوردی بوو. دیارە ماڵە گەورە ئێمەی بە خۆیی دانابوو، لەبەرئەوەی لە دەرگای بچووکەوە پێشمان کەوت ئێمەی بردە ناو ژووری یەکەمی نامەخانە. ژوورەکە لە کتێب زیاتر هیچی تێدا نەبوو. لە ئەرزەوە تا نیو مەترێك خوارووی بن میچەکە دۆڵاب و دەڵاقە بوو، کتێبی لێ ڕیز کرا بوو، لەسەر دۆڵابەکانیشەوە تا بنمیچ پەیکەری لە گەچ دروست کراوی گۆڕڕانی ئادەمیزاد دانرا بوو لە مەیموون و مرۆڤی نیاندرتاڵەوە تا ئادەمیزادی سەردەمی ئێمە.

تۆفیق وەهبی پێشوازییەکی گەرمی کردین، سوپاسی جەمیلی ڕۆژبەیانی کرد بەوەی کە داواکەی هێنایەدی و منی پێ ناساند، ئیتر ڕۆژبەیانی کەوتە گاڵتەو گەپ و لە هەموو کەسیش زیاتر تۆفیق وەهبی هێنابووە بزەو پێکەنین. هەر لەم چاوپێکەوتنی یەکەمە بوو تۆفیق وەهبی زیاتر گفتوگۆی لەگەڵ من دا دەکرد، ئەوەی بۆ ڕوون کردمەوە کە بەختیارە بەوەی کە من وەکو مامۆستایەکی خۆم هاوڕێیەتی بکەم، سوود لە

نامەخانەکەی وەربگرم، نامەخانە هەمیشە کراوەیە بۆ من و دەتوانم بیکەم بە مەڵبەندی کۆششی قوتابیەتیم لە کۆلیجی ئەدەبیاتی بەغدا. باسی ڕۆژنامەی «هەولێر»و وتارەکانیشی کردم، وتی هەر لەبەرئەوەیە حەز دەکەم یارمەتیت بدەم، بەڵکو خوێندنی بەرزیش لە دواڕۆژدا لە هەندەران تەواو بکەی.
بەڕاستی تۆفیق وەهبی و نامەخانە و ئەم پێشوازییە گەرمە بەختیاریان کردم، ئەو ڕۆژە وام هەست دەکرد کە گەنجینەیەکم دۆزیوەتەوە. ئیتر کار و کۆششکردن لەناو ئەم نامەخانە نایاب و بێ هاوتایەدا بەشێکی زۆری لە وەخت و کاتم وەرگرت بوو. هەندێ جار ئەو سەرچاوانەی لەوێ دەست نەکەوتنایە لە نامەخانەی کۆلیجی ئەدەبیات وەرم دەگرتن و کۆششەکەم دەکەوتە نامەخانەی تۆفیق وەهبی. کارکردن لەبەردەست زانایەکی وا، مەشقێکی گرنگ بوو بۆ من. ئەگەر وتارێك یا هەر نووسینێکی تری بوایە بۆم پاکنووس دەکرد، ئیتر من خەریکی کاری خۆم دەبووم و ئەویش خەریکی نووسینی خۆی دەبوو. جاری وا دەبوو بۆ ماوەیەکی زۆر لە نامەخانەکەدا هەر قسەشمان لەگەڵ یەکتری نەدەکرد، هەندێ جاریش من.

## زانای ڕەسەن

تۆفیق وەهبی گێتییەکی گەورە و تایبەتی بوو، لە ئەدگارە هەرە گرنگەکانی دەستووری بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوەی زانای ڕەسەن ئەوەبوو کە باوەڕێکی تەواوی بە تیۆری «گومان»ی دیکارت هەبوو، لای وابوو «موتلەق» دەست ناکەوێ یا بە دەگمەن دەست دەکەوێ، لەبەر ئەوە لە هەموو بیرو ڕاو نووسینێکدا دوو دڵ بوو، جاری وا هەبوو بیرو ڕایەکی لە فۆرمەیێك دا چاپیش دەکرا، بەڵام هەڵی

دەوەشاندەوە و ئەو فۆرمەیەی لادەدا و دووبارە چاپی دەکردەوە. بۆ بەڵگە لە ساڵی ١٩٥٧ کە کتێبی «إبعاد معنی الیحمور عن اسم الملك بهرام گور» لە ژێر چاودێریی من لە بەغدا چاپ دەکرا، هەمووی تەواو بوو، بەڵام دروون و برین و کردنی بە کتێب لەسەر داوای تۆفیق وەهبی ڕاگیرا، بۆ ئەوەی دووبارە بەسەر زانیارییەکان دا بچێتەوە، لەو خوێندنەوەیەدا هەندێ شتی تازەی دۆزییەوە کەوتبووە فۆرمەی دوایی، ناچار ئەو فۆرمەیەی لابرد و دووبارە چاپ کرایەوە.
بەم جۆرە زانین و زانیاری ئەم زانا گەورەیە لە بزووتنەوە و گۆڕان دا بوو، هەرگیز وەستانی بۆ نەبوو، لەجێگەی خۆشی دا مارشی نەدەکرد: ئەم خوو و ڕەوشتە کردبووی بە زانای ڕاستەقینە و کردەوە زانستییەکانی نموونەی لێکدانەوەی قووڵ و شێوازی زانستییانە و میتۆدی ئەکادیمییانەیان وەرگرتبوو، لەبەرئەوە شێوەی جیهانییان دەنواند و دووربوون لە چوارچێوەی ئیدیۆلۆجیی چینایەتی و بیرو باوەڕی نەتەوایەتی و هونەری هەڵسوکەوتی دیبلۆماسی و پرۆپاگەندەی یەك ئاخوڕی.
گەلێجار بۆ پێکەنینی هەندێ زمانیشی خوار دەکردەوە و پێی دەوتم: ئێوەی هەولێری بۆ ئەم «ئەکەم»ە ناسکە ئەکەن بە «دەکەم»ی گوێ تۆقێنەر! منیش دەمووت:

تۆفیق وەهبی لەگەڵ کۆمەڵێك لەڕۆشنبیرانی کورد لەیانەی (سەرکەوتنی کوردان) لەبەغداد، ساڵی ١٩٥٦
لەڕاستەوە: سێیەم کەس تۆفیق وەهبی، پێنجەم کەس: مارف خەزنەدار

مامۆستای بەگم من قەت نەمووتووە «دەکەم». لەوەراما
دەیووت: من مەبەستم تۆ نییە بە گشتی ناوچەی
سۆرانە. کەچی لەپاش ماوەیێك بیرو ڕای گۆڕی و
هاتە سەر ئەو ڕایەی کە لەزمانی یەکگرتووی نووسینی
دا هەرگیز دەبێ بنووسین «دەکەم» نەوەکو «ئەکەم».
ئەم «گومان» و «دوودڵیی»یە بوو بووە هۆی ئەوەی
هەمیشە بەرهەمی بڵاونەکراوەی زۆر زیاتر بێ لە
بەرهەمی بڵاوکراوە، ئەرشیفی دەستنووسی کارەکانی
خۆی گەلێ گەورەترە لە کتێب و وتارو باسی چاپ
کراو لە نامەخانە تایبەتییەکەی دا. هەر ئەمەش بووە
هۆی ئەوەی کاری زانستیی گەورەی بۆ نەکرێ
(مەبەست لە گەورە قەوارەیە) لە دەستووری زمانی
کوردی زیاتر.
بۆیە زۆربەی بەرهەمی بریتییە لە باس و لێکۆڵینەوە لە
پرسێك، بەڵام یەکجار بە قووڵیی بۆی دەچوو
و زانستییانە ساغی دەکردەوە، ئیتر ئەم بەرهەمانە بوون
بە سەرچاوەی بنچینەیی بۆ هەموو کارێکی گەورەی
تر، وەکو نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی، یا
مێژووی نەتەوەی کورد، یا مێژووی زمان و کولتووری
کوردی.

## مێرخاس و دیمۆکراتی

تۆفیق وەهبی ئەگەر چی ژیانی ماڵەوەی
ئوروستوکراتیانە بوو، بەڵام خوو و ڕەوشتی
گەلێ ساکار و میللییانە بوو. چاوتێر بوو، زیاتر لە
سوارچاکەکانی چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵی ئەوروپای
سەدەکانی ناوەڕاستی دەکرد، بۆیە لەبەر دەرگای
ماڵەکەی دا پێشوازیی هەموو میوانێکی دەکرد، بەڵام
بۆ بەڕێکردن و خودا حافیزی هەموو میوانێکی تا
دەرگای دەرەوەی باغی ماڵەکەی بەڕێی دەکرد. ئەم
ڕەوشتە وای لێ کرد بوو کە تێکەڵاوی لەگەڵ خەڵکی
دا بکا، ئەگەرچی بە ساڵاچوو بوو، هەروەها هەندێ
لەنگیش بوو نەیدەتوانی زۆر بڕوا یا لەسەر پێ بوەستێ،
بەڵام پیاسەی کۆڵانەکانی گەڕەکی وەزیریەی دەکرد،
هەندێجار پیاسەی ناو بازاڕیشی دەکرد.
جارێکیان ئێوارە بوو دەیویست پێکەوە پیاسەیەکی
شەقامی ڕەشید بکەین، (سزا)ی کوڕە گەورەی کە لەو
کاتەدا قوتابی کۆلیجی پزیشکی بوو، خۆی ئۆتۆمبێلی
لێ دەخوڕی، سواری کردین تا گۆڕەپانی مەیدان،
لەوێ تۆفیق وەهبی و من هاتینە خوارەوە، ئیتر بە (سزا)
ی وت کە لەپاش دوو سەعاتی تر لەپێش دەرگای
مزگەوتی سەید سوڵتان عەلی چاوەڕوانیمان بکات.
لە مەیدانەوە بەپێ کەوتینەڕێ. گەلێ کەس لە
ڕێبواران دەستی ڕێزیان دەخستە سەر سنگیان و
سڵاویان لەم کەڵە پیاوە دانایە دەکرد. بە درێژایی
ڕێگە یاداشت و بیرەوەرییەکانی بەغدا و شەقامی
ڕەشیدی بۆ دەگێڕامەوە، تا گەیشتینە بەرامبەر
مزگەوتی حەیدەرخانە، وەستا بەشیر موشیر بەپێوە
وەستابوو، مەترە ئاسنەکەی بە دەستەوە بوو، سەری
لە دوکانەکەیەوە دەرهێنابوو بە تەمابوو لەگەڵ
مێردمنداڵێك قسەبکات، کە چاوی بە تۆفیق وەهبی
کەوت مەترەکەی دەستی فڕێ دایە ژوورەوە و دەست
بەجێ ڕێز و حورمەتی پێشکەش کرد و لە دوکان
هاتە دەرەوە و دوو خانەنشینی کوردیش دانیشتبوون،
ئەوانیش هەڵسانە سەرپێ و بەتەمابوون بێنە دەرەوەی
دوکانەکە بۆ ئەوەی ڕێگە بۆ تۆفیق بەگ خۆش
بکەن، بەڵکو بچێتە ناو دوکان و تاوێك لەگەڵیان دا
بکەوێتە گفتوگۆ و دەمەتەقێ. بەڵام دیار بوو تۆفیق
وەهبی دەیویست تەنیا چاکوچۆنییان لەگەڵدا بکا و
زیاتریش خەریکی وەستا بەشیر بوو، تۆفیق وەهبی
لای وابوو پیشەی بەرگدروویەتییەکە قازانجی زیاتر
بوو بۆ بەشیر موشیر لە عەتاری و وردە فرۆشی. وەستا
بەشیر لەمەدا لەگەڵ وەهبی بەگا بوو، بەڵام لەکاتێك
دا وەستا بەشیر سوور هەڵگەڕا کە تۆفیق وەهبی لێی
پرسی لە سەردەمی لاویەتی دا خوێندنی قوتابخانەی
قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری شەوانی گەیاندە کامە
پۆل! بەشیر بڵمە بڵمێکی لێوە هات، پێموایە ئێستا و
ئەوساش نەخۆی و نە تۆفیق وەهبی و نەکەسی تریش
لە وەرامەکەی نەگەیشتن ئایا لە کامە پۆلدا وازی لە
خوێندنەکەی هێنا!
لەپاش ئەمە هەر وا بە پیاسە شۆڕبووینەوە تا گەیشتینە
ئۆروزدی باك، دیار بوو هەموو فرۆشیارەکانی ئەم
کۆگا گەورەیە تۆفیق بەگیان دەناسی، گفتوگۆیان
لەگەڵدا دەکرد، شتی تازەیان پێ پیشان دەدا، بەتایبەتی
لەبەشی فرۆشتنی کۆڵۆنیاو گوڵاودا. کە گەیشتینە بەر
دەرگای مزگەوتی سەید سوڵتان عەلی، سزا لە خزمەت
باوکی دا وەستا بوو. پاش ئەوەی گەڕانێکی ناوشاری
بەغدای کۆنی پێ کردین ڕووی کردە ماڵەوەی
گەڕەکی وەزیریە.

## ئەدمۆندز-ی هاوڕێی

یەکێ لەو زانا و کوردناسانەی کە تۆفیق وەهبی بە چاوی شانازییەوە تەماشای دەکرد، کوردناسی ناودار سی. جەی. ئەدمۆندس بوو. ئەمە موستەشاری وەزارەتی ناوەوەی عێراق بوو لەنێوان سالآنی (١٩٣٥ — ١٩٤٥)، لەپاش خانەنشینی بوونی، لە لەندەن دادەنیشت، خەریکی لێکۆڵینەوەی زانستی بوو لە بابەت کوردەوە، مامۆستای کوردناسیش بوو لە قوتابخانەی ڕۆژهەلآتناسی و لێکۆڵینەوە لە ئەفەریقا (سەر بە زانستگای لەندەن) پێوەندی لە نێوان ئەم دوو زانایەدا لە کۆنەوە هەبوو، لە هەموو مەسەلە و بیر و ڕایەکی زانستی و زانیاری پرسیان بە یەکتری دەکرد. بە تایبەتی ئەدمۆندس کە کتێبی «کورد و تورك و عەرەب»ە نایابەکەی بە زمانی ئینگلیزی لە لەندەن لەژێر چاپ دابوو، هەندی لە فۆرمەکانی کە هێشتا پرۆڤە بوون بۆ تۆفیق وەهبی ناردبووە بەغدا بۆ ئەوەی بژاریان بکا و هەڵەکانیان ڕاست بکاتەوە و بیر و باوەڕی خۆی بەرامبەریان دەربڕێ. ئەدمۆندس هەمیشە ناوی تۆفیق وەهبی وەکو هاوڕێیەکی ئازیز و زانایەکی کورد دەبرد. لەو ماوەیەدا من تازە کتێبی «آغانی کردستان»م چاپ کرد بوو، پارچە پەخشانێکی کوردی تۆفیق وەهبیشم گۆڕیبووە سەر زمانی عەرەبی و لە کتێبەکەم دا بلآوم کردبووەوە، ئەو پەخشانە ماتەمنامەیەك بوو بۆ کۆچی دوایی مێژوونووسی کورد ئەمین زەکی نووسیبوویەوە، ئیتر تۆفیق وەهبی پێشنیازی بۆ کردم کە دانەیێك لە کتێبەکەم بە ناوی دیاری پێشکەش بە ئەدمۆندسی بکەم. ئەوی ڕاستی بێ من لەم مەسەلەیە دوو دڵ بووم، تەنیا لەبەرئەوەی ئەدمۆندسم نەدەناسی تا مردیش هەر چاوم پێی نەکەوت، ئەگینا ئەدمۆندس یەکێکە لەو ڕۆژهەلآتناسانەی کە دڵسۆزییان بۆ نەتەوەی کورد لە پلەیێکی بەرزدا بووە، وابوو تۆفیق وەهبی وتی تۆ دانەیێکی پێشکەش بکە من لەگەڵ فۆرمەکانی کتێبەکەی خۆی «کورد و تورك و عەرەب» بۆی ڕەوانە دەکەم. ئەوەی ئاشکرایە تۆفیق وەهبی زیاتریش ئەم پێشنیازەی بۆ ئەوە بوو کە ئەدمۆندس چاوی بە پەخشانە کوردییەکەی خۆی بکەوێ کە من لە «آغانی کردستان»دا کردبووم بە عەرەبی. ئێستا و ئەوساش من شانازی بەو دوو وشەیە دەکەم کە بۆ ئەدمۆندسم نووسی لەسەر دانەیێك لە کتێبەکەم، ئەگەر لەو سەردەمەدا ئەدمۆندس وەکو کوردناسێك لە پلەیێکی دیاری کراو بووبێ لەناو دڵی مندا، ئێستا لە پلەیێکی بەرزتردایە و لە ڕیزی هارتمان و بیتنەر و هەدەنگ و لوکۆك و سۆن و لیسکۆ و مینۆرسکی و نیکیتین و ژابا و ئابۆڤیان و خالفین و لازاریف و هی تر دەوەستێ، نەك ئەوانەی گێرەشێوێنی لە ڕینیسانسی ڕۆشنبیری کوردی دەکەن وەکو مەکەنزی و تابوولۆف و ئاکوبیان و کیراکۆسیان و هی تر.

ئێمە تێکڕا کە ڕێز لەم زانا و خوێندەوارانەی گێتیی ڕۆژهەلآتناسی ئەوروپا دەنێین، لەبەر ئەوەیە کە بە گشتی ڕاستییان لەسەر ئێمە نووسیوە، بە ڕاستی لەسەر ئێمەیان کردۆتەوە، بە مێشکی خۆیان بیریان لە ئێمە کردۆتەوە نەك بە مێشکی ئێمە، ئەگینا وەنەبێ هەموویان بە تەواوی و بێ کەموکووڕی هەرچی نووسیویانە بەلای ئێمەوە ڕاست بێ. ئەوانەی خراپەشیان لەگەڵ ئێمەدا کردووە، دەبێ لەوانی تر جیابکرێنەوە، جا ئەمانە سەر بەولابن، یا بەم لابن گرنگ نییە.

دەبێ ئەوەش بۆ ڕاستی بخەمە ڕوو کە من لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە بە ئاواتەوەبووم لە نزیکەوە ئەو سێ زانایە بناسم کە تۆفیق وەهبی زۆر ڕێز و حورمەتیانی دەگرت و ناویان هەمیشە لەسەر زاری بوو: پوور داوود، مینۆرسکی، ئەدمۆندس، ئاواتی بینینی پوور داوودو مینۆرسکی لە دواییدا هاتە دی، بەلآم ئاواتی بینینی ئەدمۆندس بە ئەنجام نەگەیشت.

هاوڕێیەتی و دۆستایەتیی نێوان تۆفیق وەهبی و ئەدمۆندس لە بیست و پێنج ساڵەی دوایی ژیانی کە لەندەنی کردە نیشتەجێی خۆی گەیشتە پۆپە و بەری ئەم دۆستایەتییە لە نێوان ئەم دوو زانایەدا گەلێ کاری زانستی بوو بۆ کورد، لە سەرووی هەمووشیانەوە فەرهەنگە نایاب و بێ وێنە و ڕەنگینەکەی ئینگلیزی — کوردی بوو کە لەشەستەکان دا (١٩٦٦) لە لەندەن بلآویان کردەوە.

## دوور لە سیاسەت بۆ خوێندەواری

هەر چەندە تۆفیق وەهبی گەیشتە پلەی وەزیری و تا شۆڕشی ١٤ی تەمووزیش ئەندامی ئەنجوومەنی سینات (عەین = شێخ) بوو لە پەرلەمانی عێراقی و لە ماوەیێکیش دا دەستی خستبووە ناو دەستی

ئەوانەی (پارتی نەتەوەیی سۆسیالستی = حزب الامة الاشتراكی)یان دامەزراند و کردیانە نوێنەری خۆیان لە کوردستانی عێراق دا، بەڵام تۆفیق وەهبی پیاوی سیاسەت نەبوو، بۆ ئەم کارە دەستی نەدەدا، لە پێشانا پیاوی ستراتیجی سوپایی بوو، ئینجا بوو بە پیاوی زانستی کە بە شوێن ڕاستی دا دەگەڕا، بەڵام شانازی بە کۆمەڵی پێشکەوتووی ئینگلیز دەکرد، بیرو باوەڕی لیبراڵی هەبوو، ئەمەی لە پەرلەمانی ئینگلیز بەدی دەکرد و ئارەزووی ئەوەی هەبوو کە لە کۆمەڵێکی وادا بژی، بۆیە هەرەوەزی و هاوکاری لەگەڵ دامودەزگا زانستی و ڕۆشنبیرییەکانی بەریتانیا دەکرد و هەوڵی دەدا لەپاڵ ئەو دامودەزگایانە خزمەتی زمان و ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی بکات. جا بەم هۆیەوە دەبینین مەبەستی کاتی ئەو دامودەزگایانە چی بووبێ جێی باسی نییە، ئەوەی قازانجە ئەوەیە کە کردەوەکە بووەتە هۆی پێشکەوتنی کۆمەڵ. بۆ بەڵگە بزووتنەوەی ڕۆژهەڵاتناسی بۆ ئامانجێکی ئەمپریالیزمی و داگیرکردن کەوتە ناوەوە کەچی کردەوەکەی بوو بە سەرچاوەیێکی یەجگار گرنگ و لەبن نەهاتوو بۆ پێشکەوتنی ئەو ئادەمیزادانەی کە ئەمپریالیستەکان باپیرە گەورەکانیان دەچەوساندنەوە.

## ئێسگەی ڕۆژهەڵاتی نزیك

تۆفیق وەهبی دەستێکی باڵای هەبوو لە دەستنیشان کردنی کادیری کوردی بۆ «ئێسگەی بێ تەلی ڕۆژهەڵاتی نزیك» لە یافای فەلەستین لە ڕۆژگارانی جەنگی گێتیی دووەم. ئەم ئێسگەیە زمان و ئۆرگانی سوێند خۆران بوو لەدژی ئەڵەمانیای نازی و ئیتاڵیای فاشی، بەڵام لەژێر چاودێری و ڕێبەری بەریتانیادا بوو. جگە لە بەرنامە سیاسی و دیبلۆماسی و ستراتیجییە جەنگییەکانی ئەم ئێسگەیە بایەخێکی تایبەتی بە مێژوو و شیعر و ئەدەبیات و ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسی و زمانی کوردی دەدا، دەستنیشانی تۆفیق وەهبی و هەڵبژاردنی شاعیرێکی وەکو عەبدوڵڵا گۆران و نووسەر و هونەروەرێکی وەکو ڕەفیق چالاك لەجێی خۆیدا بوو. گەلێ جار تۆفیق وەهبی باسی لە بەهرە و توانایی گۆران و چالاك دەکرد و شانازی بەوەوە دەکرد کە لەم هەڵبژاردنەیدا سەرکەوتوو بووە.
گۆرانیش هەمیشە خۆی بە قەرزاری پیاوەتی تۆفیق وەهبی دەزانی، ئەمە و بەشێك لە بەرهەمە جوان و ڕەنگینەکانی لە شیعری لیریکی کوردی زادەی ژیانی سەردەمی «ئێسگەی بێ تەلی ڕۆژهەڵاتی نزیك» بوون لە یافا. ئەوەی ئاشکراشە لەم لایەنەوە ئەوەیە کە ئیلهامی شیعری «جوانی بێ ناو» (قژکاڵی، لێوئاڵی...) لە نازەنینێکی ئەو ناوەی وەرگرتووە، ئەو شیعرە لە دواییدا بوو بە ڕەمز لە بەرهەمی شیعری گۆران دا.

## دەنگی گێتیی تازە

تۆفیق وەهبی دامەزرێنەری کۆواری «دەنگی گێتیی تازە» بوو، بێگومان بە پێشنیاریی ئەوەوە ئەم چاپەمنییە کەوتە ناوەوە، ئەمە کۆوارێکی مانگانە بوو لە لایەن بەشی پێوەندی گشتییەوە لە باڵێوزخانەی بەریتانی دا لە بەغدا دەردەهێنرا، بەڵام سەرۆکی نووسین و بەڕێوەبەری هونەریی و تەکنیکی تۆفیق وەهبی بوو. زۆر شانازیی بەوەوە دەکرد کە ڕۆژێ لە ڕۆژان سەرنووسەری دەنگی گێتیی تازە بووە. هەموو هەوڵ و کۆششەکانی لە بابەت زمان و مێژوو و ئەدەبی کوردییەوە لەسەر لاپەڕەکانی ئەم کۆوارە ڕەنگی دابووەوە. بۆ بەڵگە هەشت بابەتی ژمارە یەکەمی (تشرینی یەکەم ١٩٤٣) لەلایەن تۆفیق وەهبی خۆیەوە نووسراوەتەوە، جگە لەوەی کە شێوازی تۆفیق وەهبی لەسەرانسەری هەموو وتار و هەواڵەکانی دا دیار و ئاشکرایە.
گەلێ جار لە تۆفیق وەهبیم بیستووە دەیووت: لەبەرئەوە حوسێن حوزنی ی موکریانی و حەسەنی شێخ حەمە مارفم دانابوو کە لە دەنگی گێتیی تازەدا ئیش بکەن، چونکە یەکەمیان خوێندەوار بوو، کوردییەکەی باش بوو، لەو ماوەیەدا بێ کاریش بوو بەوەی چاپخانەکەی ڕواندوز و هەولێری لەکار وەستێنرابوو، دووەمیان کوردی دەزانی و توانای ئەوەی هەبوو پلەی زانینی بەرزتریش بکاتەوە.
گەلێ لە وشە و زاراوە و لێکسیکۆنی کە ئێستا لە زمانی کوردی دا بەکاری دەهێنین بەتایبەتی ئەوەی لەمەڕ سیاسەت و دیبلوماسیەت و ئەدەب و هونەرەوەیە، ئەوانەن کە تۆفیق وەهبی پێشنیاری کردوون و لاپەڕەکانی دەنگی گێتیی تازە بوون بە مەیدانی مەشق و پراکتیك بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو وشە و زاراوە و لێکسیکۆنانەی کە بوون بەهۆی گۆڕان و پێشکەوتن و دەوڵەمەندبوونی زمانی کوردی. ئەوەی

لێرەدا پێویستە بووترێ ئەوەیە کە کتێبی ئاڤێستا سەرچاوەی بنچینەیی بوو بۆ دروستکردنی ئەو وشە تازانە بۆ نووسینی کوردی پەتی.

## پەیام

لە پەنجاکان دا دەزگای کاروباری ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیری لە باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە بەغدادا کۆواری «پەیام»ی دەردەکرد، لە پێش ئەویشا کۆوارەکە لەژێر ناوی «ئاگا و ڕووداوی هەفتەیی»دا دەردەچوو. ئەم چاپەمەنییە ڕاستەوخۆ لەژێر چاودێری تۆفیق وەهبی نەبوو، بەڵام بێگومان پرسی پێ دەکرا، هەر بە پیشنیاری ئەویش بەکر دلێر کرابوو بە لێپرسراوی کۆوارەکە، گەلێجار لە نامەخانەکەی تۆفیق وەهبی دا چاوم پێی دەکەوت، پرسی پێدەکرد، بیرو ڕای وەردەگرت، ئامۆژگاری لێ داوا دەکرد، هەر لە دیوەخانی نامەخانەی تۆفیق وەهبیشەوە ناسیاویم لەگەڵ بەکر دلێر پەیدا کرد.

ئێوارەیەکیان دیوەخانەی نامەخانەی تۆفیق وەهبی گەلێ کەسی لێ بوو، جەمیلی ڕۆژبەیانی و بەکر دلێریش لەوێ بوون. دیار بوو بەکر دلێر هەندێ پرس و سۆراغی لەسەر پارچە کاغەزێك نووسیبووەوە و یەکە یەکە لە تۆفیق وەهبی دەپرسی، هەمووشی پێوەندی بە وشە و ڕستە و زاراوەی زمانی کوردییەوە هەبوو بۆ پەیام. دیار بوو دەزگای پەیام دەیویست سیپارەی «التحدی الاکبر» کە بە زمانی عەرەبی پێشتر بڵاوکرابووەوە بیکات بە کوردی و وەکو بڵاوکراوەیەکی پەیام لەناو کوردانا بڵاو بکرێتەوە. بەکر دلێر تکای لە تۆفیق وەهبی دەکرد کە ناوی سیپارەکەی بۆ بکات بە کوردی، گەلێ قسە لەم بارەیەوە کرا، دانیشتوان هەموویان قسە و گفتوگۆ و پێشنیاریان کرد، بەڵام هیچ یەکێکیان بە دڵی تۆفیق وەهبی نەبوو، خۆشی شتێکی وای بۆ نەدەهات کە لێی ڕازی بێ، تا جەمیلی ڕۆژبەیانی وەکو تۆپێك بتەقێنی وتی: «التحدی الاکبر» بە کوردی دەبێتە «گەورەترین چوونە مەیدان» تۆفیق وەهبی دەستخۆشی پێوت و

ڕەفیق حیلمی

سیپارەکەش لەدوایی دا هەر بەو ناوەوە بە زمانی کوردی دەرچوو. ئەوی ڕاستی بێ لەو ڕۆژگارەدا کۆواری «پەیام» لە لایەن ئەوانەی خۆیان بە پێشکەوتنخواز دەزانی ئێسکی قورس بوو، بەڵام من دەربەستی ئەوە نەبووم، مێشکم هی خۆم بوو، بۆیە نووسراوەکانی ناو چاپەمەنییەکەم کردبوو بە دوو بەشەوە: بەشە پرۆپاگەندەکەی کە بۆ چاکەی کۆمەڵی سەرمایەداری بوو بە کارێکی خراپم دەزانی، ئێستاش هەر بە خراپی دەزانم، بەڵام بەشەکەی تری کە بۆ پەرەسەندن و پێشخستنی ڕۆشنبیری کوردی تەرخان کرابوو بەکارێکی چاکم دەزانی،

ئێستاش هەر بە چاکی دەزانم، لەبەرئەوە هەندێجار نووسینی بچووك و شیعرم بۆ دەنارد.

لە دواییدا تەنگوچەڵەمەیێکی قووڵ بۆ بەکر دلێری بەرێوەبەر دروست بوو، بەوەی کە ڕەفیق چالاك و جەمال نەبەز بە نازناو هەندێ نووسینیان لە پەیام دا بڵاودەکردەوە بۆنی پێشکەوتنخوازی و دژی چاکەی ئەمەریکای لێدەهات، ئیتر باڵیۆزخانەی ئەمەریکا کەوتە فریای چاپەمەنییەکەی، بەڵام هەرگیز نەیتوانی بزانێ نووسەری نووسینەکان کێ بوون! بۆیە چالاك و نەبەز بەر هیچ جۆرە زیانێك نەکەوتن، تۆفیق وەهبی دەورێکی باڵای هەبوو بۆ داخستنی مەسەلەکە.

## شەفەق

چاپ و چاپخانە و بڵاوکردنەوەی چاپەمەنیی کوردی بەلای تۆفیق وەهبییەوە، بەردی بناغەی پێشکەوتنی نەتەوەی کورد بوو، لەبەر ئەوە هەموو لاوێکی کوردی هان دەدا کە قۆڵی هەڵماڵێ بۆ ئەم کارە.
لە هاوینی ساڵی ١٩٥٧ کە کۆلیجی ئەدەبیاتی بەغدام تەواو کرد، پێشنیاری تۆفیق وەهبی ئەوە بوو کە داوا بکەم و لە کەرکوک دامەزرێم و یەك دوو ساڵ لەوێ بمێنمەوە، ئینجا بۆ تەواوکردنی خوێندنی بەرز ڕوو بکەمە ئەوروپای ڕۆژئاوا، یا ئەمەریکا. لەو ماوەیەدا خاڵە شێخ قادری بەرزنجی خەریکی وەرگرتنی ئیمتیازی کۆواری «شەفەق»ی کوردی و عەرەبی بوو، دیار بوو تۆفیق وەهبیش هەوڵێکی بێ وچانی بۆ دەدا بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی کۆوارەکە، وا بوو ئارەزووی مامۆستای خۆشەویستم هێنایەدی، بەمە لەگەڵ هیوا و ئامانجێکی گیانیی تریشم شاد بووم، یادی دە ساڵ لەمەوبەری ئەو کاتە کە هەر لەو مەڵبەنەدا خوێندنی قوتابخانەی ئامادەییشم وەرگرت بوو. ئیتر لەگەڵ تاقمێك ڕۆشنبیری کوردی خوێندەواری دڵسۆز خۆشترین ماوەیێکی ژیانم بردەسەر، بەڵام داخم ناچێ ماوەکە کورت بوو!
بۆ دەربڕینی دڵسۆزی تایبەتی بەرامبەر بە «شەفەق» تۆفیق وەهبی گەلێ تێبینی و سەرنجی وردی لە بابەت وشەی «شەفەق»ەوە دەربڕیوە لەو گفتوگۆیە زانستییەی کە لەگەڵ پەیامنێری شەفەق لە بەغدا جەمال خەزنەداری کردبوو، وەکو لە ژمارەی دووەمی شەفەق (١٥ی شوباتی ١٩٥٨) دا دەردەکەوێ.

## چاوتێر و جوامێری

تۆفیق وەهبی زۆر بە ئاسانی کتێبی دەبەخشی و بەدیاری پێشکەش بە هاوڕێ و دۆست و قوتابیانی

نزیك تونێلەکەی دەربەندیخان ١٩٥٧- تۆفیق وەهبیو ئاسیاخانی هاوسەری

دەکرد. ئەمە دیاردەیەکی سەیر بوو، لام وایە ئەوەی
هەوەسی کۆکردنەوەی شتێکی هەبێ ئەو شتە بە دیاری
نادا بە کەس. خۆی هەمیشە دەیووت من دیاری لە
هیچ کەس وەرناگرم، تەنیا لە خزم و کەس و کار
و دۆستە هەرە نزیکەکان نەبێ، ئەمانەش خۆم داوای
ماست و پەنیر و هەنگوین و ترخێنە و گوێز و گەزۆ
و شتی تریان لێدەکەم. دەیووت هەموو کەسێك دەزانێ
من تەنیا کتێب بە دیاری وەردەگرم. بەڵێ کتێبی بە
دیاری وەردەگرت، هەر لەو کاتەش دا کتێبی بە
دیاری دەبەخشی، چونکە زانایەکی دانا بوو، زانستی بۆ
هەموو کەسێك دەویست، دانایی بۆ هەموو کەسێك بە
ڕەوا دەبینی.

ڕۆژێکیان پێی وتم پێویستە ڕۆژانی پێنج شەموو و
هەینی داهاتوو، پێکەوە تەرخان بکەین بۆ هەڵگێڕ و
وەرگێڕ کردنی سەرتاپای نامەخانەکە، بەشێکی زۆر
لە کتێبەکان بخەینە لاوە، چونکە دەیەوێ هەندێکیان
بکات بە دیاری بۆ نامەخانەی گشتیی سلێمانی، ئەمە
ماندووبوونێکی ئەوەندە خۆش بوو کە هەرگیز لەبیر
ناچێتەوە. کتێب جیا کرایەوە، لیستەی بۆ کرا، خرایە
چەند سندووقێکەوە، ئینجا ئێوارەیەکیان سندووقەکان
برانە ئێسگەی شەمەندەفەری «باب المعضم» کە لە
ماڵەکەیانەوە زۆر نزیك بوو بۆ کەرکوك، لەوێوە بە
لۆری بۆ سلێمانی، هەواڵیشی بە نامەخانەی گشتیی
سلێمانی گەیاند بوو کە سندووقەکان نەکرێنەوە تا من
دەگەمە ئەوێ و لیستەی ناوی کتێبەکانیش لای من
بوون.

لەپاش سێ ڕۆژ ئێوارەیەك هەر بە پیاسە تۆفیق وەهبی
خۆی و هەردوو کوڕی و نەجمی پیاوی و عەبدولقادر
حیشمەت لەگەڵمدا لە ماڵیانەوە کەوتینەڕێ بۆ ئێسگەی
شەمەندەفەر بۆ بەڕێ کردنی من. ئەو دیارییانەی
تۆفیق وەهبی بۆ نامەخانەی گشتیی سلێمانی تا ئێستاکە
پارێزراون، بەڵام دیارییەکانی بۆ مەجمەعی عیلمی
کوردی کە لەوەی سلێمانی گەلێ زیاتر بوون کەس
نازانی چییان لێ بەسەرا هات!! بەڵام ڕەنگە قورئانە
دەسنووسە نایابەکەی بنەماڵەی ئێمە کە لەکاتی خۆیدا
پێشکەشی تۆفیق وەهبیم کرد بوو مابێ، چونکە
دەستنووسە! دەستنووسیش بەپێی یاسای دەوڵەت
نادزرێ!

جگە لەمە تۆفیق وەهبی ڕەچاوی ئارەزووی نزیکەکانی
دەکرد کە دیاری پێشکەش دەکردن، هەر کەسە و
حەز لەچی دەکا و هەوەسی چی هەیە، بۆ بەڵگە
کە خوێندنی کۆلیجی ئەدەبیاتم تەواو کرد و پێش
خواحافیزی دوایم لە بەغداوە بۆ کەرکووك کۆمەڵێك
کتێبی کوردی و عەرەبی کۆنی یەکجار نایاب و
بەنرخی پێشکەش کردم، ئەمانە یادگارێکی هەمیشەیی
بێ هاوتان و شانازییان پێوە دەکەم.

دەرگای دیوەخانی تۆفیق وەهبی هەردەم کراوە
بوو، خوانی نانخواردنی هەمیشە ڕازاوە بوو، ئەوەی
ئێواران وا بۆی ڕێك بکەوتایە کە تا سەعات هەشت
لە دیوەخانی تۆفیق وەهبی بمێنێتەوە، دەبوو نانی
ئێوارە لەگەڵ ئەودا بخوا. خۆی لە خواری خوارەوە
دادەنیشت، ئیتر میوان دەکشان و بەپێی زۆری و
کەمی تا دەگەیشتنە ئەوپەڕی خوانەکە. ساڵی یەك دوو
ئاهەنگی گەورەی نانخواردنی دەکرد، ئەگەر میوانێکی
ئازیزیشی بهاتایە هەرە نزیکەکانی خۆی بانگ دەکرد.
جارێکیان پیاوێکی پیری بەساڵاچووی تورك بۆ
سەردان هاتبووە بەغدا، ئەمە لەکاتی خۆیدا لە کۆلیجی
ئەرکانی ئەستەمبووڵ لە قوتابیان و هاوڕێی تۆفیق
بەگ بوو، دیار بوو هەر لای خۆشی لە ماڵەوە دابەزی
بوو. ئیتر ئێوارەیەکیان کۆمەڵێك هاوڕێ و دۆست
و قوتابی خۆی بانگ کردن، لەمانە ڕەفیق حیلمی و
ئەنوەر سائیب و عەبدولقادر حیشمەت و عەبدولجەبار
ڕێزەلی و عەبدولڕەحمان مفتی هەرە دیارترینیان بوون.
پرۆتۆکۆلی میواندارییەکە ئەوەی دەخواست کە لەبەر
میوانی ئازیز دەبوو هەموویان بە تورکی قسە بکەن،
چونکە هەموویان تورکییان دەزانی و میوان کوردی
نەدەزانی، بەڵام کەمترین قسەش بە تورکی کرا، ئەمە
ئارەزووی میوانەکە بوو، سەربەستی دابووە ئەوانی تر
کە بە هەوەسی خۆیانە بەچی زمانێك قسە دەکەن.
مامۆستایانی زمان و ئەدەبی عەرەبی و نووسەرانی
عەرەب لەلای تۆفیق وەهبی دەبینران، لەمانە مستەفا
جەواد، سەفا خەلوسی، ئەحمەد حامید سەرراف و
هی تر. لە دیوەخانەی نامەخانەدا کۆڕی گفتوگۆی
ئەکادیمییان دەبەست. بە زۆری هەڵسوکەوتی سەفا
خەلووسی ئەوە بوو وەکو کوردێك خۆی پیشان دەدا،
جارجارە بە تورکیش قسەی دەکرد، ئیتر نازانم بۆچ!
ڕەنگە لەو کاتەدا ئەمەی لەبەر تۆفیق وەهبی بووبی.
بە دەگمەن ڕێك دەکەوت دیوەخانە یا دیوەخانەی
نامەخانەی تۆفیق وەهبی چۆڵ بێ، میوانەکانی سێ
بابەت بوون، بابەتێکیان وەزیر و نوێنەری پەرلەمان

و دیبلۆماسی و سوپاییی گەورە بوون؛ ئەویتریان ئەو کەسانە بوون کە دەهاتنە لای و داوایان لێدەکرد یاریدەیان بدا لە دامەزراندنی وەزیفەی میری، یا گوێزانەوەی وەزیفە، یا مووچە زیادکردن، یا قوبووڵ کردن لە کۆلێج و قوتابخانە بەرزەکان، یا هەر هەڵسوکەوتێکی تری پێویستیی بە یارمەتی هەبێ، زۆربەی زۆری ئەمانەش کورد بوون؛ بابەتی سێیەمیان نووسەر و خوێندەوار و ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسی کورد بوون، لەبەرئەوە بوو کەسانی وەکو شاعیری ڕەندی کورد ئەوڕەحمان بەگی بابان (نفووس) و شاعیری بە دیمەنی کورد شێخ سەلام و ڕۆژنامەنووس محەمەد بریفکانی و عەبدولڕەحمان مفتی و کەریم زانستی و فەتحوڵڵا ئەسعەدو کامیل کاکەمین و سدیق قادری و هی تریش بەدی دەکران.

## زانستی و ڕاستی

تۆفیق وەهبی وەکو زانایەکی ژیر کە هەمیشە بە شوێن ڕاستی دا دەگەڕا، بە چاوێکی ڕەخنەیی زانستیانە تەماشای هەموو بەرهەمێکی دەکرد، مافی تەواوی دەدایە بەرهەمەکە خۆی، جێگەی لە پلەی زانستیدا دیار دەکرد. ئەوەی من بۆم دەرکەوت لە ئەنجامی ژیانی چوار ساڵەم لەگەڵ ئەم زانایە ئەوە بوو کە ڕێزێکی یەکجار زۆری لە مینۆرسکی و ئەدمۆندس و پووورداوود دەنا. ئەگەر وردە مەسەلەیەکی زانستی یەکێ لەم سێ زانایە بکەوتایە ژێر دەستی تۆفیق وەهبی گومانی لێ نەدەکرد و بە باوەڕێکی پتەوەوە زانیارییەکانی وەردەگرت، هۆی ئەمە بەلای ئەوەوە ئەوە بوو کە هەوەس و ئارەزوو وای لەم زانایانە کردووە کە خەریکی زانستی بن، لەبەر ئەوە بە گیانێکی سۆفیزمەوە چوونەتە ناو ئەم گێتییە بێ سنوورە پڕ لە تەنگو چەڵەمەیەو هەر سێکیشیان دوایی ژیانیان لە زانستگا بردۆتە سەر. ئەم دەزگایە جێی مشتوماڵ کردنی مێشك و گەڕان بە شوین ڕاستییە، لەبەرئەوە باوەڕێکی تەواوی بە بیروڕا و لێکۆڵینەوە و بۆچوونیان هەبوو.

ئیتر وابوو لەساڵی ١٩٥٦، لە هاوین دا کە سەرێکی ئێرانم دا، تۆفیق وەهبی نامەی بۆ پووورداوود نووسی و کۆڵێك سڵاو و ڕێزی بۆ نارد، لەگەڵ سڵاو و ڕێزی مامۆستام ئەحمەد ناجی ئەلقەیسی هەمووم گەیاندە پووورداوود و زاناکانی تری ئەو سەردەمەی ئێران. لە پووورداوود –یشەوە کۆمەڵێك کتێب و چاپەمەنیم بە دیاری بۆ تۆفیق وەهبی هێنایەوە، جگە لە کۆمەڵێك فەرهەنگی دیالێکتەکانی ئێرانی ئەوانیشم بە پارەی خۆم کڕی و بە ناوی خۆمەوە پێشکەش بە تۆفیق وەهبیم کرد.

## فێرکردنی کوردی لە یانەی سەرکەوتن

هەر لەو ماوەیەدا بوو کە تۆفیق وەهبی خۆی لە یانەی سەرکەوتن نزیك کردەوە. ویستیان گیانێکی تازە بخەنە ناو لەشی ئەم دەزگا خوێندەوارییە کوردییەی بەغدا کە لە ڕۆژی دامەزراندنییەوە تا ئەو سەردەمە لە هەڵبەزین و بەزین دا بووە. کۆبوونەوەی خوێندەواری و زانیارییان ڕێکخست، پڕۆژەی دەرکردنی کۆواری «هیوا» یان دانا، لە هەمووشیان گرنگتر کردنەوەی دەورەی فێرکردنی زمانی کوردی بوو. تۆفیق وەهبی ئەم کارەی خستە سەر شانی خۆی. هەفتەی دوو ڕۆژ کوردی فێری ئەو کەسانە دەکرد کە ئارەزووی فێربوونی ئەم زمانەیان هەبوو، زۆر سەیر بوو قوتابیان لە هەموو بابەتێك بوون، ئەوەی هەموویانی لەیەك شت کۆدەکردەوە ئەوەبوو هەموویان پیاوی بەساڵاچوو بوون، ڕەنگە هەندێکیان تەنیا لەبەر تۆفیق وەهبی خۆیان کردبێ بە قوتابی.

قوتابی ئەم دەورەیە پیاوی وەکو فازیل جەمالی تێدا بوو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان سەرەك وەزیرانی عێراق بوو، هی وەکو گۆرانیبێژی بەناوبانگ عەزیز عەلی تێدا بوو. دەبی بۆ ڕاستی ئەوەش بوترێ کە زیرەکترین قوتابی عەزیز عەلی بوو، فێری قسەکردن بوو بوو، تا گەیشتە ئەوەی گۆرانی «ئەی کوردینە! ئەی مەردینە» سروودی بەناوبانگ بە زمانی کوردی لە ئێستگەی بێ تەلی ئەوسای بەغدادا بیبێژێ. لەم دەرزانەدا من یاریدەدەری تۆفیق وەهبی بووم هەندێجار ئەگەر ماندوو بووایە من دەرزەکەم بۆ تەواو دەکرد، هەموو بەڵگەکانیشی من لەسەر تەختەی ڕەش دەمنووسییەوە، هەندێجاریش ئەگەر ئیش و کاری بوایە نەدەهاتە یانەی سەرکەوتن و وتنەوەی دەرزەکەی بە من دەسپارد.

## تیپ بۆ دەنگە خۆماڵییەکانی ئەلفوبێی کوردی

هەوڵ و کۆششی تۆفیق وەهبی بۆ ساغ کردنەوەی ئەلفوبێ و ڕاست نووسینی کوردی لەبن نایە. لەپاش جەنگی گێتیی یەکەمەوە هەرگیز فەرامۆشی ئەمەی نەکردووە. لەگەڵ چاپخانەکاندا خەریك بووە، تا گەیشتۆتە ئەوەی پێوەندی لەگەڵ کۆمپانیاکانی دروستکردنی ماکینەی چاپ و داڕشتنی تیپی چاپ پەیدا بکات. لەساڵی ١٩٥٦ پێش ئەوەی گەشتی بەیروت بکات، من هەردوو بەشی «قواعد اللغة الكردية»م بۆ پاکنووس کرد، لەوێ لە چاپخانە هەموو تیپ و دەنگە تایبەتییەکانی زمانی کوردی دانابوو ڕێکی خست بوو، ئامادەی کردبوو بۆ بەکارهێنان، کتێبەکەی خۆی پێ چاپ کرد. لەپێش ئەوەش دا، لەوکاتەی کە لاینۆتایپ لەبەغدا پەیدا بوو جێی تیپ چنینی گرتۆتەوە، تۆفیق وەهبی کەوتەخۆ، بۆ ئەم مەبەستە بە یارمەتی من و بەکر دلێر داوای لە هونەروەری کورد بەدیع باباجان کرد کە تیپە تایبەتییەکانی زمانی کوردی هەر یەکەی لەسەر مقەبایەکی گەورە بنووسێتەوە و لە پاشانا میکرۆفیلم بکرێ بۆ ئەوەی خاوەن چاپخانەکانی بەغدا بینێرن بۆ ئەڵمانیا بۆ دروستکردنی قاڵبی ئەو تیپانەی تایبەتن بە ئەلفوبێی زمانی کوردی، بەم جۆرە لە پاشانا چاپخانەکان کەوتنە چاپی کتێبی کوردی بە لاینۆتایپ.

## دوور وڵاتی

لە پایزی ساڵی ١٩٥٧ کە بەغدام بەجێهێشت بۆ کەرکوك، پەیوەندیم لەگەڵ تۆفیق وەهبی لە جاران بەهێزتر بوو. لە هەموو گەشتێکی بەغدام سەرم لێ دەدا، جارجارە تەلەفۆنم بۆ دەکرد، لەو ماوەیەدا جەمال خەزنەدار لە پێشان زیاتر سەری دەدا لەسەر ئارەزووی تۆفیق وەهبی خۆی، بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییەی من بەجێم هێشتووە ئەو پڕی بکاتەوە. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٥٨ کە بڕیاری گەشتی بەریتانیای دا، پێویست بوو من بچم بۆ بەڕێ کردنی، پێش ئەوەی ڕووبکەمە بەغدا تەلەفۆنم بۆ کرد، تۆفیق وەهبی جوامێر تەلەفۆنەکەی بە ڕێکردن حسێب کرد و وتی لەپاش ماوەیەکی تر دەگەڕێمەوە و چاومان بە یەکتری دەکەوێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا جەمال خەزنەدار و کۆمەڵێك دۆست و برادەر و قوتابیانی تری تۆفیق وەهبی ئایینی بەڕێ کردنیان بەجێ هێنا و لە ڕۆژی ١١ی تەمووزی ١٩٥٨ بە فڕۆکە بەرەو ئەستەمبوڵ کەوتەڕێ و بە هیوای ئەوەی ماوەیەك لەوێ بمێنێتەوە ئینجا ڕوو بکاتە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا. بەم جۆرە ئەو ڕۆژەی تۆفیق وەهبی لە بەغداوە ڕووی کردە ئەستەمبوڵ، من لە کەرکووکەوە بەرەو سلێمانی کەوتمەڕێ. لەوێوە بۆ پرۆژەی دوکان و بەیانی ی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ من و کۆمەڵێك لە شاعیر و نووسەر و ئەدەب دۆست لە دوکان بووین، تۆفیق وەهبیش ئەو ڕۆژە هێشتا هەر لە ئەستەمبوڵ بوو.

## لە لەندەن

ڕۆژگار و سەردەمێکی سەیر بوو، بێگومان کاری چاك کرا بوو، بەڵام نالەباری لەوەدا بوو هەندێ

ئارامگای تۆفیق وەهبی لەچیای پیرەمەگروون

لەو کەسانەی کە تۆفیق وەهبی چاکەی بۆ کردبوون کەوتبوونە هێرش بردن، بەدنمەکی وا بیر و هۆشی پیاو دەپووکێنێتەوە. ئێمە نالێین دەبوو ئەو کەسانە لەسەر تۆفیق وەهبی بکەنەوە، بەڵکو دەڵێین دەبوو بێدەنگ بن و بەس.
ژیانی لەندەنی تۆفیق وەهبی بە پیت بوو بۆ ڕۆشنبیری کوردی، ماوەیەکی زۆر لە نزیکەوە لەگەڵ مینۆرسکی و ئەدمۆندس دا ژیا، کاری چاکی کرد. کەس نەبوو لێی نەپرسێتەوە، کەسیش نەبوو لە خوێندەواری کورد بچێ بۆ لەندەن و سەری نەدا، ڕۆژگار ڕاستیی دەردەخات، ئەگەر هەندێجار بشارێتەوەش هەمیشەیی نییە، تۆفیق وەهبی ڕاست بوو، ڕەسەن بوو، بە توانا و زانا بوو، بۆیە لە دوایی دا ئەوانەی خۆشیشیان نەدەویست لێیان دەپرسییەوە، لەمانە سەیر نەبوو هەندێ کەس لە پەنجاکاندا گلەییان لە من دەکرد کە بۆچ لە تۆفیق وەهبی نزیك بوومەتەوە، کەچی هەر ئەمانە لە دواییدا داوای ناونیشان و تەلەفۆنی ماڵی وەهبی بەگیان دەکرد لە لەندەن، هەندێکیش داوای نامەی تایبەتیشیان لێ دەکردم بۆ تۆفیق وەهبی.
پێوەندیم لەگەڵ تۆفیق وەهبی نەپچڕا تا کۆچی دوایی، لە قوتابیەتی و هاوڕێیەتی دەرچوو بوو، بە تەواوی بوو بوو بە مام و برازا. هەموو هیوا و ئامانجم ئەوە بوو، دوو سێ مانگ لە تەکیەوە بم، بە تایبەتی لە ماوەی نەخۆشییە کوشندەکەی هەرە دوایی. بێگومان بەشێکی بڕیاردانی چوونم بۆ جەزائیر بۆ مەبەستی بینینی تۆفیق وەهبی بوو. بەم جۆرە لە پایزی ساڵی ١٩٨٣ بەرەو جەزائیر کەوتمەڕێ، بە ئومێدی ئەوەی هاوینی ساڵی ١٩٨٤ لەگەڵ تۆفیق وەهبی ببەمە سەر، نەوەکو تەنیا خۆم، بەڵکو بڕیار وابوو سەعدیە خەزنەدار — کە بە بووکێنی تۆفیق وەهبی دیبووی —و بنیادی نۆ ساڵیش بە بینینی ئەم فرزەندە گەورەیە شاد ببن، بەڵام ئەم ئاواتە نەهاتەدی. لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٤ ئەو ڕۆژەی لە نووسینەوەی یاداشتەکانم بوومەوە بە ناوی «ڕەفیق حیلمی و من لە دەفتەری بیرەوەری دا» لەسەر داوای دۆستم عەبدوڵڵا مەردۆخی دانیشتووی پاریس، ئەو ڕۆژەی قوتابی دڵسۆزم عەبدوڵڵا حەداد لە پاریسەوە و هاوڕێی نووسەرم حەمە ڕەسووڵی هاوار لە لەندەنەوە هەواڵی کۆچی دوایی تۆفیق وەهبی - یان پێ گەیاندم. بەم ڕەنگە ئاواتی بینینی تۆفیق وەهبی لەگەڵ خۆی دا چووە گڵەوە. پیرەمەگروون دەبێ شانازی بە پیر وەهبی، یا پیرە وەهبی - یەوە بکات.

## لەندەن بەبێ تۆفیق وەهبی

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٤ خۆم و ماڵ و منداڵ چووین بۆ مەڵبەندی زیندەگانی بیست و پێنج ساڵەی ژیانی دوایی تۆفیق وەهبی. ماڵ و ژووری نامەخانە و ژیانی هەر ئەوە بوو کە وێنەی لە مێشکم دا کێشرا بوو، پێش ئەوەی چاوم پێی بکەوێ. تەماشای ئەرشیف و کاغەز و دەستنووس و کتێبم کرد، گەلێ شتم هاتەوە یاد، هەندێ لەو کتێب و نووسراوانە پێش سی ساڵ لە نامەخانەی ماڵی وەزیریەی لە بەغدا چاوم پێیان کەوت بوو. سزا دەیووت: باوکم هەمیشە یادی تۆی دەکردەوە؛ سرووش دەیووت: باوکم لە کەس ڕازی نەبووە باسی تۆ بەخراپە بکات.
بیبلۆگرافیای کتێبەکانی لەندەنی ئامادەکرا بوو، هەندێکی خرابوونە ناو سندووقەکەوە، هی تریش هێشتا لەناو دەڵاقەکانی نامەخانەکەدا بوون. نیاز وابوو خانویەك لە لەندەن بەکرێ بگرن و ناوی بنێن «مۆزەخانە و نامەخانەی تۆفیق وەهبی» و بیکەنە دەزگایەکی لێکۆڵینەوەی کوردی. بەڵام دیار بوو ئەم پرۆژەیە سەری نەگرت.

## تۆفیق وەهبی کێیە؟

- تۆفیق وەهبی بەگ کوڕی مەعروف کوڕی محەمەدە، دایکی عاسمەی کچی ڕەسووڵ مەستی ئەفەندییە. لە ساڵی ١٨٩٢ لە سلێمانی لە دایکبووە و لە ساڵی ١٩٨٤ لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی هێنراوەتەوە نیشتمان و لە تەك پیرەمەگروون نێژراوە.
- لە حوجرە خوێندوویەتی، لە پاشانا قوتابخانەی ڕوشدیە و ئامادەیی سوپایی تەواوکردووە، ئینجا لە قوتابخانەی جەنگیی بەغدا بە لیفتینانت دەرچووە.
- بۆ تەواوکردنی خوێندنی چووە بۆ قوتابخانەی ئەرکانی جەنگ لە ئەستەمبوڵ، لە جەنگەکانی بەڵقان بەشداری کردووە. لەگەڵ کۆتایی جەنگی یەکەم خوێندنی تیۆری و پراکتیکی سوپایی تەواو کردووە.
- لە ساڵی ١٩١٩ گەڕاوەتەوە سلێمانی و یەکێك بووە لە نزیکەکانی شێخ مەحموود.
- لە ساڵی ١٩٢١ هاوبەشی کردووە لە دروستکردنی سوپای عێراق، لەساڵی ١٩٢٣ بووە بە ئامیری

قوتابخانەی سوپای عێراق و لە پلەی سوپاییش دا گەیشتۆتە کۆلۆنێلی (عەقید). گەلێ شانازی بەم پلە سوپاییەوە دەکرد و لەسەر هەندێ لە کتێبەکانی دا دەینووسی «کۆلۆنێل تۆفیق وەهبی»

- بۆ ماوەیەك موتەسەریفی سلێمانی بووە، بەڵام پێش هەڵسانەکەی ئەیلوولی ١٩٣٠ (شەشی ڕەشی ئەیلول) دەستی لە وەزیفە هەڵگیراوە و لە وڵات دوور خراوەتەوە و زیاتر لە لوبنان ژیانی ئاوارەیی بردۆتە سەر.

- لە ساڵی ١٩٣٥ گەڕاوەتەوە وڵات و بووە بە بەڕێوەبەری گشتیی کاروباری ڕێگەو بان، ئنجا بووە بە بەڕێوەبەری گشتی تۆپۆگرافی (مساحة).

- چەند جارێك بووە بە وەزیر، بەڵام وەزیری زانیاری (معارف)ی لە هەموویان زیاتر پێ خۆش بووە. لە پاشانا وازی لە وەزیفە هێناوە و بووە بە ئەندامی سینات (عین) لە پەرلەمانی عێراق دا.

- لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٥٨ چووە بۆ بەریتانیا و لە لەندەن ژیاوە تا کۆچی دوایی لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٤.

- کۆمەڵێك کتێب و وتار و باسی زمانەوانی و مێژوویی و ئەرکیۆلۆجی و فۆنۆلۆجی و ئەنتۆلۆجی و ئەدەبی بە زمانانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی بڵاوکردۆتەوە.

## تۆفیق وەهبی کوڕی پیرەمەگروون

لەپاش کۆچی دوایی زانا و دانای گەورەمان، هەندێ نووسین لە بابەتیەوە بڵاوکرایەوە، لە ناوەوەی وڵات و لە دەرەوەی، دیارترینیان ئەو لێکۆڵینەوە زانستییەیە کە هاوڕێم کەمال ڕەئووف محەمەد بە ناوی «تۆفیق وەهبی کوڕی پیرەمەگرون» بڵاوی کردۆتەوە. بنواڕە (کۆواری «کاروان» ژ ١٨، ئازاری ساڵی ١٩٨٤، ل ٢- ١٦).

## ئەنجام

تۆفیق وەهبی زاناو دانا بوو، مامۆستایەکی چاك بوو، ڕێزی لە زانای ڕەسەن دەنا، قوتابی زیرەکی خۆش دەویست، سوپاییەکی گەورە بوو، بەڵام نەیدەویست دیمەنی خوێن ببینێ، دڵسۆزی بەرامبەر دۆست و هاوڕێیانی بێ سنوور بوو، چاوتێر بوو، هەڵسوکەوتی پیاوانە بوو، لە پێوەندی کۆمەڵایەتی دا دیمۆکراتییانە بوو. لە گۆڕان و جووڵانەوەدا بوو، باوەڕی بە وەستان نەبوو. ڕقی لە کەس نەبوو. سۆزی بەرامبەر ڕۆژهەڵاتناسانی ئەوروپا بە نەتەوایەتی و ڕژێمی وڵاتەکانیانەوە نەدەبەستەوە. چەندە ئەدمۆندسی ئینگلیزی خۆش دەویست، ئەوەندە گلەیی لە قوتابییەکەی دەکرد کە مەکەنزی - یە.

تۆفیق وەهبی بە کوردی ژیا و بە کوردی مرد، پیرەمەگروون بە لای ئەوەوە دروشمی «ناهید» و «میترا» بوو، لەبەر ئەوە بوو ئەوەندەی من ناسیومە و دیومە، ناوی پیرەمەگروون لەسەر دەمی نەکەوتووە، بۆیە بوو بە یار و یاوەری هەمیشەیی پیرەمەگروون.

# تۆفیق وەهبی
# ڕۆشنبیر و
# سیاسەتمەدارێکی کەم وێنە

پرۆفیسۆر د.کەمال مەزهەر

## ڕۆڤارێکی شایستە بۆ تۆفیق وەهبی

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم و بڵاوکراوەی ڕۆڤار لەو دەزگایە، کارێکی باشیان کرد بیریان لە نووسەر و ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدارێکی خەمخۆری نەتەوەی کورد تۆفیق وەهبی کردەوە، بۆ ئەوەی نەوەی نوێ لە بەرهەم و شەونخونی و شاکارەکانی ئاشنا بێت، کاتێکیش هەردوو بەڕێزان م. ڕەئوف بێگەرد و کامەران سوبحان داوایان لێکردم سەرەقەڵەمێك لەسەر لایەنە جیاوازەکانی ئەو نووسەرە خەمخۆرەی کورد بنووسم، نەمتوانی دەست بە ڕوویانەوە بنێم، بۆیە دەخوازم ئەم وتارە کورتە لەسەر تۆفیق وەهبی لانی کەم ڕووناکییەکی بچووك بێت لەسەر مەکۆی بەرهەم و شاکار و هەڵوێستەکانی.
ڕەنگە لە ئێستادا قسەکردن لەسەر ڕۆشنبیر و نووسەرێکی دیاری نەتەوەکەمان کە بەشی هەرە زۆری تەمەنی بۆ خزمەتی زمان و مێژوو و ڕۆشنبیریی و سیاسی نەتەوەکەی بووبێت، کارێکی زۆر ئاسان نەبێت، بە تایبەتیش ئەو ڕۆشنبیرە کۆمەڵێك ئەزموون و بەرهەمی دانسقەی لە چەندین قۆناغ و بواری جیاوازدا پێشکەشی نەتەوەکەی کردووە، بۆیە پێویستە بۆ خوێندەوار و ڕۆشنبیرانی نەوەی نوێمان بە وردی ئاگایان لەم کەڵە ڕۆشنبیرە بێت و بە وردی بەرهەم و بابەت و کتێبەکانی بخوێننەوە، لەوەش گرنگتر بۆ من لەم ساتەدا و لەم سەرقاڵییە زۆرەی تەمەنمدا هەڵوێستەکردن لەسەر تۆفیق وەهبی کەمێك نارەحەت و بارگرانی بێت بەسەر بیر و هۆش و تەندرووستیمەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێت پێم خۆشە بۆ ئەو ژمارە تایبەتەی ڕۆڤار کێومالێکی خێرا بە وێستگە گرنگەکانی ژیان و بەرهەمەکانی تۆفیق وەهبی بەگدا بکەم و تیشکێکی خێرا بخەمە سەر چەند کار و هەڵوێستێکی نیشتیمانی ئەو.

## وێستگە جیاوازەکانی ژیانی تۆفیق وەهبی بەگ

تۆفیق وەهبی بەگ لە ١کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٩١ لە سلێمانی لە دایکبووە، باوکی کە کۆچی دوایی دەکات ئەو منداڵ بووە، سەرەتای خوێندنی لە شاری سلێمانی بووە، دواتر لە ساڵی ١٩٠٤ چووەتە بەغدا و لەوێ ناوەندی و دواناوەندی سەربازی بە پلەی باڵا تەواو کردووە، دوای ئەوە چووەتە ئەستەنبوڵ، کە ئەو کات ئەستەنبوڵ پایتەختی دەوڵەتی عوسمانیی بووە، لەوێش لە کۆلێژی ئەرکان وەرگیراوە و بووەتە زابت ڕووکن و پلەی سەربازی زۆر بە زیرەکیی و ئازایەتی تەواو کردووە و ئەمەش دەبێتە کەشکۆڵێکی بەهێزی باگراوندی پسپۆڕی لە بواری سەربازی و جەنگیدا.
لە سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانیدا، تۆفیق وەهبی لە شەڕی (چەنە قەلعا) بەشداری کردووە، دواتر تۆفیق وەهبی دێتەوە بۆ عێراق و بۆ شەڕکردن دژی هێزەکانی بەریتانیا، لە ناوچەی شوعەیبە کە هێزەکانی عوسمانی کشانە دواوە بەرامبەر هێزە بەریتانییەکان لە ئەیلولی ساڵی ١٩١٧، ئەمیش لەگەڵیاندا کشاوەتە دواوە، لەو شەڕەشدا کە لە شاری ڕوومادی قەوماوە و ئەویش لەگەڵ هێزە عوسمانییەکاندا کشاوەتەوە بۆ ناوچەی هیت، لە ساڵی ١٩١٨ بەشداری کردووە لە شەڕی فەلەستیندا، دوای ئەوە کراوە بە ڕائید لە سوپای عوسمانیدا، لەو کاتەدا ئەڵمانەکان هاوکاری عوسمانییەکان بوون، هەر لەو کاتەشدا مەدالیای قەرەمانییەتی وەرگرتووە، دوای کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ١٩١٨ عوسمانییەکان تووشی شکان بوون ئەو گەڕایەوە بۆ کوردستان و دواتریش چووە بەغدا، دوا بەدوای ئەوە بوو بە یەکێك لە ئەفسەرە دیار و بەناوبانگەکانی کورد لە سوپای عێراقیدا، ئەو سوپایەی کە لە ڕۆژی ٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢١ دامەزراوە، دوای ساڵێك کە هێزە ئینگلیزەکان بەسەر هێزەکانی شێخ مەحموودی بەرزنجی زاڵ بوون، تۆفیق وەهبی بۆ ماوەی ٤٢ ڕۆژ بەند کرا، دوای ئازاد کردنی هەم دیسان چووەوە بۆ بەغداد و لە هێزی سەربازی سوپادا کرا بە موقەدەم، لە ساڵی ١٩٢٩ دا وەك بەرپرسێکی سەربازی نێررا بۆ بەریتانیا بۆ ئەوەی بەشداری بکات لە خولێکی جەنگیی و سەربازیی و دوای یەك ساڵ واتە لە ساڵی ١٩٣٠ پلەی سەربازی کرا بە عەقید، پاش گەڕانەوەی لە بەریتانیا دوا بەدوای ئەوە ڕاستەوخۆ کرا بە پارێزگاری شاری سلێمانی، بەڵام بەهۆی خۆپیشاندانی ٦ی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٠ لە سلێمانی سازکرا، ئینگلیزەکان توانییان سەرای سلێمانی داگیر بکەن و تۆفیق وەهبی لە پارێزگار لاببەن، بەڵام لە ساڵی ١٩٣١ دا دوای ئەوەی شێخ مەحموودی بەرزنجی لە دژی سەرکردەکانی عێراقی لە ناوچەی ئاوباریکدا جەنگی پێکەوە لەگەڵ تۆفیق وەهبی هانی کوردەکانیان دەدا کوردایەتییەکی پاك بکەن، بەڵام ئەوەبوو ئینگلیزەکان بەسەر شێخ مەحمووددا سەرکەوتن و ئیدی تۆفیق وەهبی لە ساڵی ١٩٤٦ هاتە بەغدا و پاش ماوەیەك بووە وەزیری ئابووری لە حکومەتەکەی حەمدی پاچەچیدا، لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ کرایە وەزیری بەرگری و مەعاریفی عێراق، هەر لەو کاتەشدا بووە ئەندامی مەجلیسی نوێنەرانی عێراق، دوای شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ تۆفیق وەهبی عێراقی بەجێهێشت، چونکە ئەو بە لایەنگیریی دەوڵەتی پاشایەتی دادەنرا و بۆ یەکجاری نەگەڕایەوە بۆ عێراق و لە بەریتانیا و لە شاری لەندەن نیشتەجێ بوو، تا ساڵی ١٩٨٤ لە تەمەنی ٩٣ ساڵیدا لەوێ کۆچی دوایی

کرد، بەپێی وەسێتی خۆی تەرمەکەی گوێزرایەوە بۆ چیای پیرەمەگروون و لە مەراسیمێکدا کە من و سەدان ڕۆشنبیریی کورد ئامادەی بووین تەرمەکەی بە خاك سپێررا.
جێگەی ئاماژە بۆ کردنیشە لەو کاتەدا زۆر گرنگی درا بە مەراسیمی ناشتنی تەرمی تۆفیق وەهبی، جگە لە ئامادەبوونی بەڕێز مام جەلال کۆمەڵێك ڕۆشنبیر و شاعیری کورد، شیعر و وتاریان خوێندەوە، لەوانە کاك شێرکۆ بێکەس بە پارچە پەخشانێك بەشداری مەراسیمی ناشتنی تەرمی تۆفیق وەهبی بەگی کرد و چەندین وتار و پەخشان و بەرهەمی تر لەو مەراسیمەدا پێشکەش کران.

## خەرمانی بەرهەم و نووسینە گرنگەکانی تۆفیق وەهبی بەگ

دیارە تۆفیق وەهبی بە زمانەکانی کوردی، عەرەبی، تورکی، ئینگلیزی کۆمەڵێك کتێبی گرنگی چاپ کردووە، کە هەریەك لەو کتێب و بەرهەمانە بۆخۆی ئێستا سەرچاوەیەکی گرنگ و پڕ بایەخی کتێبخانە و ڕۆشنبیریی نەتەوەکەمانن، من لێرەدا ئاماژە بە گرنگترینیان دەکەم کە بریتین لە :
*دەستووری ڕێزمانی کوردی لە ساڵی ١٩٢٨ لە بەغدا چاپ بووە.
* رجعیه المانیه وعباده القوه لە ساڵی ١٩٤٢ لە بەغداد چاپ بووە.
*الاصل والاسقرار فی اصل المعنی لە بەغداد چاپ بووە
* کتاب عن الرشاشات، بالترکیه العثمانیه، طبع من قبل الحکومه العثمانیه.
*خوێندەواری باو)، بەغداد ١٩٣٣
* سی. جی. ادموندز، قسنێك لە کوردستان، بەغداد ١٩٤٧. (ترجمه من الانکلیزیه).
* القصد والاستطراد فی اصول معنی بەغداد ١٩٥٠، مجله (المجمع العلمی العراقی).
* رجعیه المانیه وعباده القوه، بەغداد ١٩٤١.
* قواعد اللغه الکردیه، الجزء الاول (الباب الاول-الباب الثانی)، بیروت، ١٩٥٦.
* إبعاد معنی الیحمور عن إسم بهرام گور، بغداد، تموز ١٩٥٧.
* قلعه کیانیه فی شمال السلیمانیه، بغداد،مجله الکاتب، عدد٢، تموز ١٩٥٨.
* دراسات عراقیه، بغداد، ١٩٥٨.
* اصل تسمیه شهرزور، مجله سومر، ج١و٢، بغداد، ١٩٦١.
* اصل اسم کرکوك، بەغداد ١٩٥٨.
* القاموس الکردی إلانکلیزی، بالاشتراك مع س. ج. ادموندز، جامعه اکسفورد، ١٩٦٥.
* سفره من بازیان الی طاسلوجه، بەغداد ١٩٦٥.
* بقایا المیثرائیه فی الحضر وکردستان العراق وأثارها فی الایزیدیه، لندن، ١٩٦٥ (بالانکلیزیه).
دیارە بەدەر لەم کتێب و لێکۆڵینەوانەش کۆمەڵێکی تر بابەت و وتاری هەمەجۆری هەیە، کە ڕەنگە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نەبێت ئاماژە بە هەموویان بکەین، بەلای منەوە ئەوانە مشتێك بوون لە خەرمان و بەرهەمی ڕۆشنبیریی ئەو ڕۆشنبیرە کوردەمان، بە هیوای ئەوەی لە داهاتووشدا زیاتر هەڵوێستەی وردتر و بەرفراوانتر لەسەر بەرهەم و ژیانی بکەین.

## تۆفیق وەهبی وەك نووسەر،

تۆفیق وەهبی لە باو باپیرییەوە دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەی بابانییەکان، بەڵام هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆی ئەمەی نەوتووە، چونکە ئەو خۆی زۆر گەورەتر بووە لە چوارچێوەی خێڵ و گروپێکدا خۆی قەتیس بکات، بۆیە ئەو پێویستی بەوە نەبووە لە هەموو شوێنێك باسی ئەوە بکات کە ئەو بابانییە، بەڵکو هەمیشە وەك خزمەتکار و نەتەوە پەروەرێکی دیاری کورد خۆی نیشان داوە بەبێ ئەوەی باس لە بنەماڵە و خێزان و تیرەکەی بکات، ئەمەش بێگومان پشت ئەستوور بووە بەو باگراوندە ڕۆشنبیریی و هزرییە دەوڵەمەندییەی کە لەسەرەتای لاوییەوە تا مردنی کۆی کردبووەوە.
بیرمە لە ساڵی ١٩٧١ کاتێك کە ئێمە کۆمەڵێك ئەکادیمی و نووسەر، کۆڕی زانیاریی کوردمان دامەزراند لە شاری بەغداد، تۆفیق وەهبی وەك ئەندامی یاریدەدەری کۆڕی زانیاریی کورد هەڵبژێررا، چونکە پێمان وابوو ئەو پیاوە یەکێکە لە ڕۆشنبیر و خوێندەوارە گەورەکانی نەتەوەکەمان و پێویستە یارمەتی دەر و هاوکار و ئەندامی ئەو کۆڕە ڕۆشنبیرییەمان بێت، لەبەر ئەوەی ئێمە پێمان وابوو ئەو لە هەموو بوارەکانی ڕۆشنبیریی و فەرهەنگیدا توانی بووی ئەسپی خۆی تاوبدات و خزمەتی نەتەوەکەی بکات، گەر ئێستاش سەیری ئەو بڕیارەی ئێمە بکەیت، بۆتان دەردەکەوێت بڕیارەکەمان لە شوێنی خۆیدا بووە.
ئەگەر سەیری بەرهەمەکانیشی بکەین دەبینین لە زۆر بواردا و بە زۆر زمان نووسیوویەتی، ئەمەش تەنها لەبەر خزمەتی کورد بووە، بابەتی مێژوویی، زمانزانی، فەرهەنگ، یاداشت و زۆر شتی تری نووسیووە، بەتایبەتیش لەسەر یەزیدییەکان کتێبێکی نووسیووە و باس لە بنەچەیان دەکات وەك بەشێکی دانەبڕاوی نەتەوەی کورد، چونکە تەنها دوژمنانی نەتەوەی کورد یەزیدییەکان بە بەشێکی دابڕاوی کورد دەدەنە قەڵەم، بەتایبەتیش

شۆڤێنییەتی عەرەب و تورك و فارس، بەڵام ئەو لەو
کتێبەیدا بە وردی وەڵامی هەموو ئەو شۆڤێنییانە دەداتەوە
و بنەچەی ڕەسەنایەتی یەزیدی وەك بەشێکی دانەبڕاوی
کورد دەخاتە ڕوو، ئەوە دەسەلمێنێت یەزیدییەکان تەنها
ئاینیان لە کورد جیاوازە، ئەگەر نا یەك میللەتن لەگەڵ
ئێمە و بەشێکی دانەبرا□و و ڕەسەنی میللەتی کوردن.
بەدەر لە لایەنی نووسین و ڕۆشنبیریی تۆفیق وەهبی لە
ڕووی سیاسیشەوە خەمخۆرێکی گەورەی نەتەوەی کورد
بوو، پێچەوانەی هەندێ سەرکردەی تری دڵسۆزی کورد،
توانی لەم لایەنەشەوە سوود بە گەلی کورد بگەیەنێ،
بەداخەوە دەڵێم شێخ مەحموودی بەرزنجی نەمر لەم
ڕووەوە کەوتە هەڵەوە بەتایبەتیش لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ
ئینگلیزەکان، کاتێك نوێنەری مستەفا کەمال ئەتاتورك
هاتە ڕەواندز و لەگەڵ شێخ مەحموودی بەرزنجی
دانیشتن، شێخ بڕیار دەدات هاوکاری تورکەکان بکات
دژ بە ئینگلیزەکان، ئەم زانیارییانە لەخۆڕا نییە، بەڵکو لە
دەستنووس و لە دیکۆمێنتی مۆزەخانەی ئینگلیزەکاندا
پارێزراون، کە ڕەنگە ئەم زانیارییە بەلای زۆرێك لە
خوێنەرانەوە نوێ بێت و بپرسن چۆن؟ من دەڵێم پێشتر
کە لە ڕووسیا بووم وام دەزانی ڕووسەکان لە دیکۆمێنت
و پاراستن و پارێزگاری کردن لە بەڵگەنامەکاندا یەکەمن،
لەبەر ئەوەی بەشێك لە کوردستان لەسەر یەکێتی
سۆڤییەت بووە، بەڵام دوای ئەوەی بەڵگەنامە نهێنییەکانی
دەوڵەتی بەریتانیم بینی، زانیم بە پێچەوانەوەیە، بەڵکو
ئینگلیزەکان زۆر دەوڵەمەندترن لە یەکێتی سۆڤییەت
و زۆر جوان توانیوویانە پارێزگاری لەو دەستنووس و
بەڵگەنامە گرنگانە بکەن کە لە وڵاتاندا دەسیان کەوتووە،
یان بەسەریاندا هاتووە. بەڵگەنامە نهێنییەکانی دەوڵەتی
بەریتانیا ئەوانەی کە من بینیوومن پێشتر بڕیار بووە کەس
نەیبینێت، بەڵام لەژێر فشاری ڕای گشتی ئەو وڵاتانەدا
ئەو بەڵگەنامانە بڕیار دراوە دوای پەنجا ساڵ ببینرێت و
دواتریش کرا بە سی و پێنج ساڵ، ئەو بەڵگانە ئەوەمان
پێ دەڵێن ئەو دیبلۆماسییە بەریتانییانە ڕاستییەکان چۆن
بووە ئاوامان بۆ دەگێڕنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار
خۆیان باوەڕیان بەو ڕاستیانە نەبووە، بۆیە لەناو ئەو
دەستنووس و بەڵگەنامانەدا دەیان و سەدان بەڵگەی گرنگ
و پڕ بایەخ هەیە لەسەر فەرمانڕەوایەتی شێخی نەمر و
قۆناغی داگیرکاری بەریتانیا لە عێراق، بەڵام داخەکەم
تەمەن و کات بەشی کۆکردنەوەی هەموو ئەو بەرهەمانە
نادات، ئەوەی کە تۆفیق وەهبی و سەدان نووسەر
و ڕۆشنبیریی تری وەك ئێمە کردوومانە، هیوادارین
ڕۆژێك بێت نەوەی نوێ جارێکی تر و بە شێوازێکی
گەورەتر و جوانتر، درێژەی پێبدات و تەواوکاریان بێت
بۆ دەوڵەمەندبوونی ڕۆشنبیریی نەتەوەکەمان لە بواری
فەرهەنگ و مێژوو و دەوڵەتداریدا.

**تۆفیق وەهبی کۆتاییەکانی ژیانی**

# «تۆفیق وەهبی» و شەفەق

د.جەمال خەزنەدار

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی پێنجی ئەم مانگە ساڵی (١٩٥٨)، تەلەفۆنێکم لەگەڵ مامۆستام مەعالی (تۆفیق وەهبی) کرد، بۆئەوەی سەعاتێك لە وەختی بپچڕێنمەوە بۆ شەفەق، مامۆستا هاتەسەر تەلەفۆن، پاش چاکو چۆنی، وتی: ئەمڕۆ سەعات پێنج ناتوانم چاوم پێت بکەوێ، چونکە خەریکی لێکۆڵینەوەی باسێکی عیلمیم لەگەڵ دکتۆر (صفاو خلوصی)، جا لەبەرئەوە، کەی ئەتوانی چاوت پێم بکەوێ؟ وتم: بەیانی، وتی: وشەی بەیانی پاش سەعات دوانزەی ئەم شەوەوە دەست پێ ئەکات تاکو سەعات دوانزەی نیوەڕۆ، جا لەبەرئەوە، ئەم بەیانییە کەی ئەبێ؟ وتم: کەوابێ بەیانی نییە، بەڵکو پاش نیوەڕۆی سبەینێیە. ئنجا مامۆستام وتی: سەعات چواری پاش نیوەڕۆ، بەیەك بگەین.

سەعات چوار چوومە لای مامۆستا، وتم: مامۆستا لەبەرئەوەی کە جەنابتان پسپۆڕێکی زمانی کوردین، وە ئاگادارێکی زۆرتان هەیە لە دەستووری زمانی کوردی و فیلۆلۆژی زمانەکە، لێرەدا ئەمەوێ چەند پرسیارێکتان لێ بکەم. وتی: فەرموو. وتم: مانای (الشفق) چییە؟ وە لە چییەوە هاتووە؟

وتی: وشەی (الشفق)ی عەرەبی، نازانم ئەسڵەکەی لە کوێوەیە!

(الشفق) بەعەرەبی، بە وەختی زەردەی ئێواران ئەڵێن. بەڵام (شەبەق)ی کوردی، بە وەختی تاریك و لێڵی بەیانی ئەڵێن، کە «فجر»ی عەرەبییە. وتم کەوابێ «شەبەق» لە چییەوە هاتووە؟ وتی: لام وایە وشەی «شەبەق»ی ئێمە، لە وشەی «شەوەکی»یەوە هاتبێ، ئنجا نازانم ئەم ئەسڵە چی دەربەستێکی هەیە لەگەڵ وشەی «شەفەق»ی عەرەبی دا.

وتم: جگە لە کورد و عەرەب، هیچ نەتەوەیێکی تر هەیە ئەم وشەیە بەکاربێنێ؟ وتی: «شەفەق»ی لای غەیرە عەرەب، واتا نەتەوە ڕۆژهەڵاتیە موسڵمانەکانی تر، دیسانەوە بە مانای (فجر)ە. وتم: کەوابێ بە کوردی نابێ ئەم وشەیە بە «شەفەق» بنووسین، بەڵکو ئەبێ بە شەبەق بینووسین، وەکو ئێوە ئەفەرموون. وتی: بەڵێ ڕاستە، بە کوردی ئەبێ «شەبەق»ی پێ بڵێین نەك شەفەق.

ئینجا وتم: جەنابتان فەرمووتان کە ئەشێ «شەبەق» لە «شەوەکی»یەوە هاتبێ، ئایا وشەی «شەو»، وشەیەکی کوردییە و لەچییەوە هاتووە؟

وتی: وشەی «شەو» ئەسڵەکەی «خشەپە»یە، بۆتە «شەپ» لە پاشا «شەو». «شام»ی فارسی، وە «شێو و شێوان»ی کوردی، لەوێوە هاتوون. وە لام وایە کە «ئەخشام» (ئێوارە)ی تورکیش هەر لەوێوە هاتبێ، وە وادیارە کە شکڵی ئەخشام کۆنترە لە شەب و شەو و شام و شێوی فارسی و کوردی، چونکە «خ» یەکەی، «خشەپ»ی پاراستووە.

وتم: سپاسی بێ پایانتان پێشکەش ئەکەم، وە پێش ئەوەی کۆتایی بەم دانیشتنە بێنم، ئارەزووم ئەوەیە کە جەنابتان بیروباوەڕی خۆتان دەربارەی شەفەق (گۆڤار-ر. س) دەربڕن.

وتی: شەبەق بۆشاییێکی دیار پڕ ئەکاتەوە، لە شارێکی خۆشەویستی وەکو (کەرکووك)، وە هیوام وایە بە ئیملایەکی کوردی، لەوە ڕێکوپێك تر، بنووسرێتەوە، وە گۆڤارەکە ببێتە زانستگایێکی بەکەڵك.

# تۆفیق وەهبی، زمانناس
# مێژوونووس و کۆنەناسی کەم وێنە

د. کۆزاد محەمەد ئەحمەد

لە نێو هەموو ئەو کوردانەی لە زمانی کوردی و مێژوو و شوێنەوار و ئایین و کولتوری کوردیان کۆڵیوەتەوە، مامۆستا تۆفیق وەهبی جێگایەکی ئێجگار تایبەتیی هەیە. لەوەش زیاتر، ئەم جێگایە کە بە ماندوو بوونێکی زۆر بە خوێندنەوە و نووسین و کاری چەندین ساڵە بەدەستی هێنابوو، لەپاش کۆچی دوایی لە ١٩٨٤ دا، چۆڵ بوو و تا ئێستاش کەسێکی تر پەیدا نەبووەتەوە ئەو چۆڵییەی ئاوەدان بکاتەوە. ڕەنگە ئەم وتەیە بەلای هەندێکەوە زۆر بێت و بە ماف خواردن یان بەقەدر نەزانیی بەرامبەر بە زماناس و مێژوونووسە کوردەکانی دواتری بزانن. حاشا ئەگەر نووسەری ئەم چەند دێرە ماندووبوونی زۆری ئەو هەموو زانایە بەکەم بزانێت کە لە دارشتنی ڕێزمان و فەرهەنگ نووسی و لێکۆڵینەوەی شێوەزمان بەراووردکاری و کۆکردنەوەی فۆلکلۆردا جێ پەنجەیان لە سڕینەوە نایەت، ئەمەش بەدەر لەو هەموو لێکۆڵینەوە مێژووییەی مێژوونووسانی کوردی پاش مامۆستا تۆفیق وەهبی ئەنجامیان داون. بەڵام، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبی خەسڵەتێکی تایبەتی تریان هەیە کە، ئەو تۆزەی لێ دەربچێت کە مامۆستا مەسعود موحەممەد لە 'لسان الکرد' دا خۆی لێ داوە، لەلای هیچ کام لەوانی تر نییە و نەبینراوەتەوە.

ئەم خەسڵەتە گرنگەش، هەرچەندە بنەمایەکی گرنگ و پایەیەکی بەهێزی هەموو کارە زانستییەکانی مامۆستایە، کەچی، ئەوەندەی نووسەر ئاگادار بێت، تا ئێستا جێگای شایستەی خۆی لە ژیاننامەی مامۆستا دا وەرنەگرتووە.

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە نووسینەکانیدا، چی لێکۆڵینەوەی مێژوویی بن، یان زمانەوانی یان ئایینی، پشت بە شارەزاییەکی زۆر باش لە زمانناسی (فیلۆلۆجی) ی ئێرانیدا دەبەستێت. ڕاستییەکەشی ئەوەیە کە هیچ لێکۆڵینەوەیەکی کوردناسی لە بوارەکانی زمان و مێژووی پاش هەزارەی یەکەمی پ.ز. و کولتوور و ئایینی کورد (بە تایبەتی هی پێش ئیسلام)، بەبێ ئەم زانستە بەهایەکی زانستییانەی نییە، یان لانی کەم کەلە. ناکرێت لە زمانی کوردی بکۆڵرێتەوە، بنەچەی وشەیەك بدۆزرێتەوە، ڕەوتی پەرەسەندنی دیاری بکرێت، یان دیاردەیەکی ڕێزمان ڕاڤە بکرێت ئەگەر تەماشای زمانە ئێرانییە کۆنەکانی وەك ئاڤێستایی و فارسی کۆن و پەهلەوی ساسانی و پەهلەوی پارتی-ئەشکانی و سۆگدی و خوارزمی و هی تر نەکرێت، ناتەواویش دەبێت ئەگەر لەگەڵ سانسکریتی بەراورد نەکرێت و لەوێدا بۆ بنەچەی نەگەڕێین. ناتوانین لە بواری مێژوویی و جوگرافیای مێژوویی دا شوێنێکی کۆن کە لە سەرچاوە کۆنەکاندا لە هەر دەقێك و بە هەر زمانێك بە شێوەیەك نووسرابێت دیاری بکەین و شوێنەکەی بدۆزینەوە ئەگەر لەو زمانە کۆنانەدا شارەزا نەبین و نەتوانین بەهۆیەوە شێوە جیاوازەکانی ناوەکە نەدۆزینەوە بە دوای پەرەسەندنی دا نەڕۆین. بۆیە لێکۆڵینەوەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبی، بە بوونی زانیاریی و شارەزایی لەم جۆرە و لەم مەیدانەدا، دەکرێت بڵێین مەودای سێیەمیان هەیە و هاوتایان دەگمەنە.

لەم بابەتەدا هەوڵ دەدەم هەندێك، نەك هەموو، لە دۆزینەوە گرنگەکانی مامۆستا بخەمە بەرچاو و پیشانی بدەم کە چۆن شارەزایی و زانینی خۆیی لە لێکۆڵینەوەکانیدا بەکار هێناوە و لە ڕێیانەوە گەیشتووەتە ئەنجامەکانی.

لە بابەتی "بنەچەی کوردان و زمانیان"[1] دا چەندین جار بەڵگەی لە زمان و دیالێکتە ئێرانییەکانی ترەوە هێناوەتەوە و کوردی بە دیالێکتە جیا جیاکانییەوەی لەگەڵ ئەو زمانانەدا بەراورد کردووە. هەر لەو بابەتەشدا شارەزاییەکەی لە دیالێکتە جیاکانی کوردی دا دەردەکەوێت. بەراووردکاری لە نێوان کرمانجیی خواروو و سەروو و هەورامی و گۆرانی و زازا لە لایەك و بلوچی و فارسی نوێ و فارسی ناوەڕاست و پارتی-ئەشکانی و ئاڤێستایی و میدی و فارسیی کۆن لە لایەکی ترەوە لە هەموو شوێنێکی ئەم باسەیدا دەبینرێت. هەر بۆ نموونە پەرەسەندنی برگەی هوە- ی سەرەتای وشە بۆ خوە- و فـ- لەم زمان و دیالێکتانەدا[2] یان گۆڕانی یـ- ی سەرەتا بۆ جـ-.[3] لە بابەتی "ئەسڵی پیتە قاڵبی 'ئە' ی شێوەی سلێمانی"[4] دا بە شێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش و کارامە، لە ڕێی بەڵگەی زمانەوانی و مێژووییەوە مێژووی دروست بوونی دیالێکتی ناوچەی سلێمانیی نووسیوە و هەندێ لە سیما کۆنەکانیشی خستووەتە بەرچاو. لەوێشدا بەهەمان شێوە، بۆ پاڵپشتیی بیرو ڕاکانی بەڵگەی زمانەوانی و بەراووردکاریی لە زمانە ئێرانییە کۆنەکانەوە هێناوەتەوە.

---

١– ئەم بابەتە بە عەرەبی بە ناونیشانی "اصل الاكراد و لغتهم" لە بەشی عەرەبیی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی ٢، بەشی ٢ دا بڵاوکراوەتەوە. دواییش کرایە کوردی و بە جیا بڵاوکرایەوە. هەر وەك لەم باسە و باسێکی تریشدا (بڕوانە: حول مقال "مسؤولیة الادیب الکردي الکبری" للأستاذ عبد المجید لطفي، ص. ٣٨٤، چاپی نوێ کە لە سەرجەمی بەرهەمی مامۆستا توفیق وەهبی دا سەرلەنوێ بڵاوکراوەتەوە کە بنکەی ژین بە ناونیشانی: توفيق وهبي بك، الآثار الكاملە، اعداد رفيق صالح، الجزء الاول، السليمانيه، ٢٠٠٦ دا چاپ کراوە) ئاماژەی پێ کردووە، دیارە کە مامۆستا باسەکەی لە بنەڕەتدا بە ئینگلیزی نووسیوە. بۆ عەرەبییەکەی بڕوانە: وهبی، توفيق، "اصل الاكراد و لغتهم،" گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی ٢، بەشی ٢، القسم العربي، بەغدا، ١٩٧٤، ص. ١-٢٤.

٢- بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل. ١٣-١٥.

٣- هەمان سەرچاوە، ل. ١٢-١٣.

٤– توفیق وەهبی، "ئەسڵی پیتە قاڵبی 'ئە' ی شێوەی سلێمانی،" گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی ١، بەشی ١، بەغدا، ١٩٧٣، ل. ٩–٣٤.

لێکۆڵینەوەکەشی لە ئایینی کوردان لە پێش ئیسلامدا دانسقەیە. زۆر بە وردی و ئاکادیمیانە و دوور لە سۆزی نازانستییەوە نووسراوە. لەوێدا بە پشت بەستن بە سەرچاوە مێژووییەکان و زمانناسیی ئێرانیی کۆن گەیشتووەتە دەرئەنجامی زۆر گرنگ و بەبەها کە تا ئەمرۆی ئێستاش هەمان بەها و گرنگیی جارانیان ماوە و کەمن ئەو خاڵانەی دەکرێت بۆیان زیاد بکرێت، یان ڕای نوێیان لەسەر بدرێت. لەوانەش، کە لە ناو کوردانی پێش ئیسلامدا ئایینی دیان و مەزدیەسنایی٥ و ئایینی هیندو-ئەورووپیی سەردەمانی زووی پێش زەردەشتییان تێدا بڵاو بووە.٦ هەروەها کە 'تاوس مەلەك' ی ئێزیدیان لە 'دیاوس' ەوە هاتووە کە لای باووباپیرانی هیندو-ئەورووپایی مان خواوەندی گەورەی ئاسمان بووە. مەودای بڵاوبوونەوەی ئایینی میترایی لە کوردستانی کۆندا و زۆر بابەتی گرنگی تر.

لە نێو گرنگترین شیکردنەوە و ئێتیمۆلۆجییەکانی٧ مامۆستا تۆفیق وەهبی دا کە تیایاندا سەرکەوتوو بووە و دەرەنجامی گرنگی تریان لە بواری مێژوو و زمان و ئایینی کۆنی کورد دا لێ پەیدا بووە شیکردنەوەی ناوی 'داسن' ە کە جاران بە ئێزیدییەکان دەووترا و بە ڕای ئەو لە 'دەئێڤە یەسنا' وە هاتووە٨ کە واتای دەئێڤە پەرستان دەبەخشێت. دەئێڤە بە خواوەندانی پێش پەیدابوونی ئایینی زەردەشت دەووترا، کە زەردەشت هات و لە نێو خواوەندە کۆنەکاندا هەرە گەورەیانی کرد بە تاکە خواوەندی گەورە و پەرستنی ئەوانی تری یاساغ کرد، هەندێك لەسەر بیرو باوەڕی کۆنی خۆیان مانەوە و هەر 'دەئێڤە'٩ کانیان دەپەرست، لەوانیش زۆر خەڵکی کوردستانی دێرین کە ئێستا، بە ڕای مامۆستا ئێزیدییەکان لەوانەن ماونەتەوە و ئایینی هەرە کۆنی خۆیان پاراستووە کە زۆر لایەنی ئایینی میتراییشی تێدایە. هەر لەم بوارەدا ڕای وایە کە ئایینی مەزدیەسنایی لە هەندێك ناوچەی کوردستاندا بڵاو بووەتەوە، بە تایبەتی ئاوەدانییە گەورەکان و ئەو شوێنانەی لە چەقی دەسەڵاتەوە نزیکتر بوون، لەو شوێنانەش پێ دەچێت شارەزوور بووبێت، بۆیە بە ڕای ئەو عەربەت لە 'ئەپهر بەت' ەوە هاتووە و زەرگەتە لە 'ئاژهرکەدە' ەوە و موان یش لە 'موغان' ەوە.١٠ بەڵام داخەکەم ڕوونی نەکردووەتەوە بۆچی لە دوو شوێنی نزیك بە یەکدا دوو شێوەی جیاواز بۆ وشەی ئاگر بەکار هاتووە، لەم لا ئاپهر و لەولا ئاژەر؟ دەبێت لە بنەڕەتدا یەکێك لەم دووانە ناوی شوێنێکی تر بووبێت دوور لەوی تریان و لە پاشدا ئەو ناوە لەم شوێنە نزیکەش نرابێت؟ یان دەشێت هەردوو شێوەکە لە یەك شوێندا بە کار هاتبن یان لە کۆن دا هەردوو ناوەکە یەك شێوەیان هەبووە و بە دوو ڕێگای جیاوازدا پەرەیان سەندووە، یەکێکیان بۆ ئاپهر و یەکێکیان بۆ ئاژەر؟ ئەوە هەر مامۆستا خۆی دەیتوانی وەڵامی بداتەوە!

یەکێك لە تێبینییە گرنگەکانی مامۆستا کە تۆماری کردوون ئەوەیە کە ناوی 'گاور' کە ئێستاش هەندێك جار بۆ دیان و هەندێك جار بۆ 'ناموسوڵمان' بە کار دێت و زۆربەی ئەو شوێنەوارانەی هی پێش ئیسلامن بە 'گاور کرد' وەسف دەکرێن لە بنەڕەتدا وشەیەکە بە زەردەشتییەکان وتراوە. بە ڕای مامۆستا وشەکە لە 'گەبر' ەوە هاتووە کە واتای زەردەشتی دەبەخشێت.١١

یەکێك لە شارە گرنگەکانی کوردستانی پێش ئیسلام شاری 'شەهر کەرد'١٢ بووە کە مامۆستا شوێنەکەی بە یەکێك لە

---

٥- مەزدیەسنایی بریتی بووە لە تێکەڵاو کردنی زەردەشتی و پاشماوەی ئایینە کۆنەکانی پێش خۆی کە لە سەردەمی ساسانی دا شێوەی وەرگرت و کرایە ئایینی فەرمیی ئیمپراتۆریی ساسانی. بۆ ئەمە بڕوانە: توفیق وهبی، "دین الکرد القدیم،" الآثار الكاملة، ص. ٤٦.

٦- توفیق وهبی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص. ٥٤. توفیق وهبی، هەروەها: "یقایا المیثرائیة في الحضر و كردستان العراق و آثارها في الایزیدیة،" الآثار الكاملة، ص. ٩٣.

٧- ئێتیمۆلۆجی بە واتای گەڕان بە دوای بنەچەی وشە و چۆنیەتی دروست بوونی و مێژووی بەکارهێنانی و ڕەوتی پەرەسەندنی دێت.

٨- توفیق وهبی، "دین الکرد القدیم،" الآثار الكاملة، ص. ٥٣، الهامش ٤١، ص. ٧٦.

٩- دەئێڤە یان دەیڤا ناوێکی زۆر کۆنە و واتای 'خواوەند' یان 'خودا' دەبەخشێت. لە پاشتردا بووە بە 'دێو،' هەر ئەم یاساغ کردنەشە کە بووەتە هۆی ئەوەی لای ئێمە وشەی دێو واتایەکی ناشایستەی هەبێت، ئەگینا هەر هەمان وشەیە کە لە زمانە ئەورووپییەکاندا تا ئێستاش وشەی 'خودا' دەبەخشێت، بۆ نموونە لە فەرەنسی دا Dieu و لە ئینگلیزیدا سیفەتی 'خودایی' وشەی divine ە و 'خوداوەند' diety ە. بەڵام وشەی 'خودا' خۆی لە کوردی و فارسی دا لە چییەوە هاتووە، ئەوا بە ڕای رحیم شایگان ئەم وشەیە لە کۆنەوە لە پەهلەویدا بە واتای 'سەروەر' هەبووە و بۆ ئاماژە بۆ خودا بەکارهاتووە (وەك 'رب' لە عەرەبی دا)، و بە هاتنی ئیسلام ئێرانییە تازە موسوڵمانەکان دەبوایە وشەکانی 'یەزد/ئیزەد' و 'بەی' وەلا بنێن، چونکە ئاماژەی ڕاستەوخۆ بوون بۆ خودای زەردەشتی، بەڵام، هەر بە ڕای ئەو، بۆ ئەوەی بە تەواوی لە مێژوو و کەلەپوور و ڕابردووی ڕۆحییان دا نەبڕێن ئەم وشە پەهلەوەیەیان بەکار هێناوە کە هەم ئاماژەیە بۆ خودا و هەم لە کەلەپوری دێرینی خۆیشیانە. بڕوانە:
Shayegan, R. H., "The Evolution of the Concept of *xwadāy* "God"," *Acta Orientalia Academiae Scientiarum Hung.* 51 1-2 (1998), p. 49-54.
بۆ وشەی دەئێڤە و واتا جیاوازەکانیشی بڕوانە:
Bartholomae, Ch., *altiranisches Wörterbuch,* Berlin, 1904 (n. ed. 1961), p. 667-670.

١٠- توفیق وهبی، "دین الکرد القدیم،" الآثار الكاملة، ص ٥٤، الهامش ٤٧.

١١- وهبی، توفیق، سفرە من "دەربەندی بازیان" الی "ملەی تاسلوجە"، بغداد، ١٩٦٥، ص. ٢٠.

١٢- لە سەرچاوە عەرەبی و سریانییەکاندا ناوی بە 'شهرقرد' هاتووە.

شوێنەوارەکانی دۆڵی چەرمەگا دەزانێت. پادشای ئەم شارە و خەڵکەکەی لە سەدەی ٣ی زایینی دا لەسەر دەستی مار ماری ئورفە بوونەتە دیان.١٣ بەرای ئەم، ناوی ئەم شارە خشە پروکەرتە (بە واتای 'کردەی پادشا') بووە کە لە فارسیی ناوەڕاست دا بووەتە شەترە کەرتە و خشەترە کەرتە هەروەك لە نووسینە ساسانییەکەی کەعبەی زەردەشت دا هاتووە.١٤ مامۆستا دەڵێت ئەم ناوە لە زمانی میدیی ناوەڕاست دا خسەترەکەرتە بووە١٥ بۆیە لە کتێبەکەی ستراباۆ دا بە سادراکای نووسراوە.١٦ هەر بۆ پاڵپشتی لەم ڕایەی خۆی ئاماژەی بەوەش کردووە کە کاتی خۆی ڕیچارد فرەی لەگەڵ هاوتاکردنی ئەم ناوەدا بووە لەگەڵ شەهر کەرت.١٧ تەنانەت فرەی لە چاپە نوێیەکەی کتێبەکەیدا لەسەر مێژووی دێرینی ئێران، ناوەکەی هەر بە شەهر کەرت خوێندووەتەوە.١٨

شیکردنەوەی بۆ ناوی چەندین شوێنی تریش کردووە کە جیاوازە لە شیکردنەوە خەیاڵی و نازانستیەکانی بە گشتی لە لایەن کەسانی ترەوە بۆیان دەکرێت، بۆ نموونە ناوی 'باسەرە' ی بردووەتەوە سەر 'ڤاسەرە' ی سانسکریتی و 'ڤاهەرە' ی فارسی کۆن کە واتای پرشنگدار، ڕوون دەبەخشێت و لە ئێرانیی نوێ دا بووەتە ڤەهار بە واتای بەهار.١٩ باسەرە لە هەمان کاتدا ناوی ناوچەیەکی ڕۆژهەڵاتی بەلخ بووە لە ئەفغانستان و دێیەکی تریش لە نزیك میرزا ڕۆستەمی ژێر دەریاچەی ئێستای دوکان.٢٠ بۆ وشەی 'قۆپی' ش کە زۆر جار بۆ 'دەربەند' بە کار دێت بۆچوونی وایە کە لە 'گۆپ' ی هیندو-ئەورووپییەوە هاتووە کە لە ئاڤێستایی دا بووەتە گۆپرە.٢١

---

١٣- توفیق وهبی، "دین الکرد القدیم،" الآثار الکاملة، ص. ٥٣.

١٤- بۆ دەقی ئەم نووسینە بۆ نموونە بڕوانە:
Frye, R. N., The History of Ancient Iran, München, ١٩٨٤, p. ٣٧٣.

١٥- توفیق وهبی، «قلعة کیانیة في شمال السلیمانیة،» الآثار الکاملة، ص. ١٨٥، ١٨٩.

١٦- توفیق وهبی، "قلعة کیانیة ....،" الآثار الکاملة، ص. ١٨٤-٥، ١٨٦. لەم چاپە نوێیەی ئەم باسەدا لە الآثار الکاملة دا ناوی شارەکە دەمێك بە سادرکێ و دەمێك بە سادارکی و دەمێك بە سادراکی نووسراوە، بۆیە بۆ شێوەی ڕاستی ناوەکە تەماشای کتێبەکەی ستراباۆم کردەوە و لەوێدا بە Sadracae نووسراوە، بڕوانە: Strabo, The Geography of Strabo, vol. VIII (indexes), The Loeb Classical Library, ed. E. H. Warmington, London, ١٨٦٧, p. ٤٦١.

١٧- وهبی، "قلعة کیانیة .....،"ص. ١٨٥.

١٨- بڕوانە: Frye, The History of Ancient Iran, p. ٣٧٣.
بەڵام وادیارە بەهۆی هەڵەی چاپەوەیە کە ناوی دژداری شەهرکەرت لە کتێبەکەی "الآثار الکاملة" ی مامۆستادا لە 'تیر-میهر' ەوە بووە بە 'تیرمیە.'

١٩- وهبی، توفیق، سفره من ....، ص. ١٠. هەرچەندە مامۆستا ئەم دوو وشەیەی بە 'ف' نووسیوە، بەڵام پێدەچێت مەبەستی 'ڤ' بووبێت، چونکە لەو فەرهانگانەدا کە لامن هیچ کام لەم وشانە لە بەشی پیتی 'ف' دا نین. وا دیارە لە چاپە عەرەبییەکەدا بە هۆی نەبوونی پیتی 'ڤ' وە بە 'ف' نووسراون.

٢٠- وهبی، سفره....، ص. ١٣.

٢١- وهبی، سفره....، ص. ٣٦.

ناوی دەرگەزێن کە ناوی گوندێك و لە هەمان کاتدا گەرەکێکی شاری سلێمانیشە، زۆر کارامانە براونەتەوە سەر بنەچە کۆنەکەی. بەرای مامۆستا ئەم ناوە لە هەردوو وشەی 'دەرگە' و 'زێنە' وە هاتووە. 'دەرگە' کە لە زمانی ئاڤێستادا 'دەرغۆ' یە واتای 'درێژ' دەبەخشێت و 'زێنە' ش، کە لە ئاڤێشتایی دا 'زەئێنە' یە واتای 'چەك' دەبەخشێت و بەم شێوەیە واتاکەی دەبێتە '(خاوەنی/ هەڵگری) چەکی درێژ.'٢٢ هەر بەڕای ئەو، ئەوانەی ئەم گوندە و لە پاشیشدا ئەم گەڕەکەیان ئاوەدان کردووەتەوە خەڵکی شارۆچکەی دەرگەزێن بوون کە لە ئێران دا بووە و پاش وێران کردنی لەلایەن خەسرەو پاشای عوسمانییەوە لە ١٠٣٩ ی کۆچی دا کۆچیان هێناوە بۆ ئەم ناوچەیە و ئەم گوندەیان ئاوەدان کردووەتەوە.٢٣ ڕایشی وایە کە خەڵکی ئەو شارۆچکەیە لە بنەڕەتدا هۆزێکی ئێرانیی٢٤ کۆن بوون و ناویان وا بووە، ئەمەش سەیر نیە ئەگەر بەراووردی بکەین بە ناوی 'تیگراخەودا' سکایی (=سکیپی) بە واتای خاوەن خودەی نووك تیژ و 'دەرگۆبازو' کە لە ئاڤێستادا هاتووە بە واتای بازوو درێژ.٢٥ هەر بۆ دڵنیایی زیاتر لە شێوە و واتای ئەم دوو وشەیە تەماشای فەرهەنگە بەناوبانگەکەی بارتۆلۆمەم کرد کە فەرهەنگی زمانە ئێرانییە کۆنەکانە و هەردوو وشەکە بە هەمان واتای کە مامۆستا ئاماژەی پێکردوون هاتوون.٢٦

هەر لە بواری لێکۆڵینەوەی لە ئایین و بیروباوەرە کۆنەکانی کوردستاندا گرنگییەکی تایبەتیی بە چیای پیرەمەگروون داوە و ڕای وا بووە کە مەڵبەندێکی ئایینیی کۆن بووە کە تیایدا خواوەندانی کۆن پەرستراون. لە کتێبی "سفره من دربندی بازیان الی ملەی تاسلوجە" دا باسی لەمە کردووە. هەرچەندە بە داخەوە ئاماژەی بە سەرچاوە نەکردووە، نووسیویەتی کە ئامیتیس ی کچی ئاستیاگس چووەتە سەر لوتکەکەی و لەوێ قوربانیی بە گەورە خواوەندانی خۆیان دیاوس پیتەر (خواوەندی ئاسمان) و میترا و هی تر کردووە.٢٧ لە بەرگی یەکەمی کتێبی "قواعد اللغە الکردیە" شدا لە ڕاهێنانەکاندا نووسیویەتی کە کێوی پیرەمەگرون بە پەرستگای میهر و سەراوی سوبحاناغای بە پەرستگای ناهیە (=ئەناهیتا) دەزانێت.٢٨

لە چەندین باسی تریشیدا وەك کۆنەناسێکی شارەزا و ئەکادیمی هەندێك لێکۆڵینەوەی ئەنجام داوە کە نیشانەی تێگەیشتن و شارەزایی و گیانی زانست پارێزیی مامۆستان. ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەو لەم بوارەدا تا ئێستاش کەم وێنەن و لێکۆڵینەوەیەك کە لەو ئاستەدا بێت و بە کوردی نووسرابێت تا ئێستا زۆر کەمە. لەم لێکۆڵینەوانەیدا زانیارییەکانی لە مێژوو و هونەر و باوەڕ و زمان و جوگرافیا و تەنانەت جیۆلۆجیاشی بەکارهێناوە و هەر یەکەیانی بە شایستەیی و لەجێی خۆی و بە پێی پێویست بۆ خزمەتی باسەکەی خستووەتە کار. لە بابەتێکی وەك ئەوەی لەسەر قەڵای جوڵندی نووسیویەتی، دەبینین ئاگاداری بڵاوکراوە کۆنەناسییەکان بووە کە لەسەر هەردوو گۆڕە شاهانەکانی قزقاپان و کور و کچ نووسراون، ئاگاداری نەخشە هەڵکەندراوە ئاشورییەکان بووە کە وێنەی موساسیریان لەسەر هەڵکەندراوە و لەگەڵ قزقاپان دا بەراووردی کردوون و لێکدانەوە و ڕاڤەی خۆیشی لەسەر نووسیون. بۆ دیاریکردنی شوێنی شاری شەهرکەرد و دیاریکردنی پێناسەی قەڵای جوڵندی و مێژووی دەربەندەکانی بازیان و باسەرە چەندین بەڵگەی مێژوویی هێناوەتەوە هەر لە سەرچاوە کلاسیکییەکان (بە تایبەتی ڕۆمان) و سریانییەکان٢٩ و عەرەبییە کۆنەکان و تورکییە عوسمانییەکان تا دەگاتە سەرچاوە نوێیەکان کە بە چەندین زمانی جیاواز

---

٢٢= وهبی، سفره....، ص. ٢٥.

٢٣= وهبی، سفره....، ص. ٢٥-٢٦.

٢٤- ئێرانی وەك زاراوەیەکی مێژوویی و فەرهەنگی هەر شتێك دەگرێتەوە کە هاوبەش بێت لە نێو میدییەکان و فارسەکان و سکاییەکان و هۆز و نەتەوە ئێرانییەکانی تردا کە بە زمانی هیندو-ئێرانی قسەیان کردووە و لە کولتوور و فەرهەنگدا لەیەك نزیك بوون، بۆیە دەبێت لە 'ئێرانی' ی ئێستا جیا بکرێتەوە کە زاراوەیەکی سیاسییە و تەنها ئێرانی ئەمرۆ دەگرێتەوە.

٢٥- وهبی، سفره....، ص. ٢٦.

٢٦- بۆ 'دەرگە' و 'دارەغا' بروانە ل. ٦٩٣ و بۆ 'زەئێنە'ش ل. ١٦٥٠ ی ئەم سەرچاوەیە:
Bartholomae, Ch., altiranisches Wörterbuch, Berlin, ١٩٠٤ (ed .n. ١٩٦١).

٢٧- وهبی، سفره....، ص. ٢٩.

٢٨- بروانە: وهبی، توفیق، قواعد اللغة الکردیة، الجزء الاول، بغداد، ١٩٥٦، ص. ٤٢٦ (چاپی نوێ لە کۆی بەرهەمەکانی، کە بنکەی ژین چاپی کردووەتەوە). لەم چەند ساڵەی پێشوودا لە گردێکی سەراو پەیکەرێکی برۆنز دۆزرابووەوە کە باڵای بەقەدەر باڵای مرۆڤێك بووە، بەڵام بەداخێکی زۆرەوە، وەك زۆر شوێنەواری گرنگ و کەم وێنەی تری کوردستان، لە لایەن باندەکانی تاڵانەوە ئەویش بە تاڵان برا و کرایە دەستی بێگانانەوە و ئێستا کەس نازانێت چی بەسەر هاتووە، ئەگینا دەکرا زانیاریی زۆر گرنگمان لێوە هەڵبهێنجایە لەبارەی مێژوو و پێناسەی سەراوەوە. دەشیا ئەم پەیکەرە ڕاستیی ڕاکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی بسەلماندایە.

٢٩- بۆ ئەمە سوودی لە کتێبێکی لە ڕادەبەدەر گرنگ کردووە کە بۆ مێژوو و جوگرافیای مێژوویی کوردستانی سەردەمی ساسانی گەنجینەیەکی بێهاوتایە و بەداخەوە تا ئێستا، ئەوەندەی من ئاگادار بم، لە نێو مێژوونووس و کۆنەناس و زمانەوانەکانی کورددا مامۆستا تۆفیق وەهبی لێ دەربچێت کەسی ترم نەدیوە ئاماژەی پێ بکات و سوودی لێ ببینێت. ئەم کتێبە بەسەرهات و ژیاننامەی ئەو دیانانەن کە لەسەر دەستی ساسانییەکان چەوسێنراونەتەوە و کوژراون. بەسەرهاتەکان لە لایەن هۆفمانەوە کۆکراونەتەوە و بە ئەڵمانی لە چاپ دراوە. بە پێی ئەوەی لەو دەمەدا ئایینی دیان لە کوردستاندا برەوی هەبوو و زۆر کەس چوونەتە سەر ئەو ئایینە و زۆریش لەوانەی کاریان بۆ ئەوە دەکرد خەڵك ببەنە سەر ئەو ئایینە دەهاتنە کوردستان و زۆریشیان خۆیان خەڵکی کوردستان بوون، بۆیە زۆری ڕووداوەکان لە کوردستاندا ڕوویان داوە و

نووسراون.٣٠ ئەمە جگە لە بەڵگە زمانەوانییەکان لە کۆمەڵێك لە زمانە کۆنەکانەوە. لە دیاریکردنی ئایینی شاری هاترا (= الحضر) بەوەی کە ئایینی میترایی بووە پشتی بە شوێنەوارە ماددییەکانیشیان بەستووە، بە تایبەتی پەیکەر و نەخش و نیگارەکانیان کە بە وردی و بە چاوی کۆنەناسێکی لێزان و وریا لێیانی کۆڵیوەتەوە.٣١

لە بابەتێکی دەگمەنیدا لەسەر نەخشە هەڵکەندراوەکانی گوندۆك٣٢ پاش وەسفێکی وردی نەخشەکان لێکدانەوەیەکی ئەنترۆپۆلۆجییانەی بۆ کردوون و بەوەی داناون کە پەیوەندییان بە هەندێك مەراسیم و کاری جادووەوە هەیە کە مرۆڤی کۆن لە پێناو بەدەستهێنانی زیاتری ڕاو و شکانی دەستەڵاتی بەسەر گیانداری کێوی و لەم ڕێیەوە دابین کردنی خۆراکییەوە هەیە.٣٣ لێکۆڵینەوە لەم نەخشە هەڵکەندراوانە کارێکی پێشەنگ بوو.

بە پێی ئەوەی کە خۆیشی ئەفسەر بووە و لە زانستی سەربازی دا زۆر شارەزا بووە، شیکردنەوەی بەبەهای بۆ ئەو لەشکرکێشییانە و ڕێگای هات و چوونیان کردووە کە کراونەتە سەر کوردستان و ڕای نوێی خۆیی لەسەر هەندێکیان تۆمار کردووە، بۆ نمونە لەشکرکێشییەکانی عوسمانی و سەفەوی و شەڕەکانی نێوان بابانەکان و فەرمانڕەوایانی بەغدا و تەنانەت لەشکرکێشییەکەی هرقل ی قەیسەری بیزەنتی بۆ سەر شارەزوور لە ٦٢٧ ز. دا کە لە گەشتە مێژووییەکەی دا لە دەربەندی بازیانەوە بۆ ملەی تاسلوجە و لێکۆڵینەوەکەیدا لەبارەی قەڵای جوڵندی یەوە باسی کردوون.٣٤

ڕاستە مامۆستا تۆفیق وەهبی بەشی هەرە زۆری لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانی بۆ کورد و کوردستان تەرخان کردووە، بەڵام لە مێژوو و کۆنەناسی و فەرهەنگی وڵاتان و ناوچەکانی تری دەرەوەی کوردستانیش شارەزا بووە. ئەم شارەزاییە لە بابەتەکانی وەك ئەوەی لەسەر ناوی بەغدا نووسیوێتی و وەك نامیلکەکەی کە بۆ ڕاست کردنەوەی واتا و بنەڕەتی ناوی بەهرامی گۆر ی پادشای ساسانی نووسیونی، بە ڕوونی دەردەکەوێت. لە باسی بەهرامی گۆر دا ڕای هەموو مێژوونووسانی پێش خۆی پەرچ داوەتەوە، هەر لە مێژوونووسانی کۆنی موسوڵمان (المسعودي و الخوارزمي و الپعالبي و ابن الاپیر) تا دەگاتە ئێرانییەکان (نیظامي گەنجەوی و حمد الله المستوفي القزويني و میرخواند و پیرنیا) و ئەوروپاییەکان (کریستنسن) و ڕایەکی نوێی نووسیوە کە واتای 'بەهرامی دەشتەکی' یان 'لادێی' یە بەو پێیەی لەناو عەرەبەکانی "حیرە"ە دا گەورە بووبوو و ناحەزەکانی لێیان نابوو چونکە حەزیان نەدەکرد ببێتە پادشای ئێران.٣٥ کە تەماشای باسەکەشی دەکەین لەبارەی لێکدانەوەی ناوی بەغدادەوە، سەر سوڕ دەمێنێت لەو هەموو زانیارییە زۆر و زەبەندەی لەو باسەدا کۆی کردوونەتەوە. ئاگاداری دوایین بڵاوکراوە و توێژینەوەی لێکۆڵینەوە مێخییەکان بووە و لە چەندین شوێنی دەقە مێخییەکاندا ناوی بەغدا (بە شێوەی 'بەگدا') ی دۆزیوەتەوە. وشەی 'بەگ' و 'باگا' ی لە هەموو سەردەمەکاندا بە هەموو شێوە جیاوازەکانییە و دۆزیوەتەوە و بەراوردی کردوون و لە وشە ئاوێتە و لێکدراوەکاندا دەستنیشانی کردوون.٣٦ ئەنجامگیرییەکەشی کە ناوی بەغدا واتای 'بەخششی خودا' دەبەخشێت زۆر ڕاستە، ئەوەندە نەبێت کە دەشێت ئەم ناوە لە سەردەمانی هەرە کۆندا، بۆ نمونە لە سەردەمی بابلیی کۆندا کە بۆ یەکەمجار لە بەڵگەنامەیەکی سەردەمی حەموڕابیی (١٧٩٢-١٧٥٠ پ. ز.) پادشایاندا ناوی بەگداتو هاتووە، ناوێك بووبێت بە زمانێکی تر و بە واتایەکی تر، بەڵام لە پاشدا بە هەمان شێوەی بە زمانی هیندو-ئەوروپیش بەکارهاتبێت، بەڵام بەم واتایەی کە باس کرا. ئەمەش دیاردەیەکی باوە لە ناوی شوێندا کە چەندین جار و لە چەندین شوێن دووبارە بووەتەوە.

---

ناوی سەدان کەس و شوێن و ڕووداوی تیادا هاتووە کە شایانی لێکۆڵینەوەی ورد و لەسەر نووسینە و سەرچاوەیەکی زۆر گرنگن. ئەم هەلە بۆ سەرنج ڕاکێشانی خوێنەران بۆ گرنگیی ئەم کتێبە دەقۆزمەوە بە ئومێدی ئەوەی گرنگیی پێ بدرێت. ئەمەش ناونیشانی تەواوی کتێبەکەیە:

Hoffmann, George, Auszüge aus syrischen Akten persischer Märtyrer, übersetzt und durch *Untersuchungen* zur historischen Topographie erläutert, Leipzig, ١٨٨٠.

٣٠- بۆ ئەمانە بڕوانە: وهبی، "قلعة کیانیة ... ،" الآثار الکاملة، ص. ١٧٣ بەدواوە، هەروەها: وهبي، سفره....، ص. ١٩٣ بە دواوە.

٣١- بڕوانە: وهبی، توفیق، "بقایا المیثرائیة في الحضر و کردستان العراق و آثارها في الایزیدیة، " الآثار الکاملة، ص. ٨٦ بە دواوە، بە تایبەتی ٨٨.

٣٢- لە پێشدا بە کوردی لە نامیلکەیەك دا بڵاوکراوەتەوە، لە پاشتریشدا کراوە بە کوردی و لەم سەرچاوەیەدا بڵاوکراوەتەوە:
وهبي، توفیق، "المنحوتات الصخرية في كهف طندك في كردستان، " ترجمة شنه المفتي، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد، بەرگی ١٦ و ١٧، بەغدا (١٩٨٧)، ل. ٥٥١-٥٦٨.

٣٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل. ٥٦٣.

٣٤- وهبی، سفره من ....، ص. ٩، ١١-١٩، هەروەها: وهبی، "قلعة کیانیة .....،" ص. ١٩٠.

٣٥- وهبی، توفیق، ابعاد معنی الیحمور عن اسم الملك بهرام طور، بغداد، ١٩٥٧، ص. ٣٤.

٣٦- بڕوانە: وهبی، توفیق، "القصد و الاستطراد في اصول معنی بغداد،" الآثار الکاملة، ص. ٢٩٤-٣١١.

کاتێك كە داوام لێکرا بۆ زانای پایە بەرزی کورد تۆفیق وەهبی شتێك بنووسم، دەست و قەڵەمەکەم لە ئاستی گەورەیی ئەم جوامێرەدا داچڵەکین، لەبەر خۆمەوە وتم، کێ بێت بتوانێ حەقی ڕەوای خۆی بداتێ و لە چوارچێوەی سەردەمە جەنجاڵەکەیدا وەك خۆی بینرخێنێ (تقییم)و گەورەییەکەی بەیان بکات؟ کێ بێت بەسنگی ڕووت و قەڵەمێکی لەرزۆکەوە ئامبازی پیرەمەگرونێك لە زانایی و کوردایەتی و خەمخۆری نەتەوەکەی بێت؟ مرۆڤ هەرچەند دەکات نازانێت لە کوێوە چنگە کرێ بکات و لەکامە بوارەوە دەست بەکاربێت؟ لە بواری لێهاتووییەکانی لەبەرەکانی جەنگی ئەلبانییەکاندا وەك ئەفسەر و بەرپرسیارێك؟ یان لە بەرێوەبردنی وەزارەتەکانی (المعارف، الاقتصاد، الشؤون الاجتماعیة) و گەلێ پۆستی گرنگی تر لە بەغدا و سەرجەم عێراقدا؟ کە بە شایەتی عەرەبەکان لە پۆستە جیاجیاکاندا ئێجگار سەرکەوتوو و نموونەیی بووە، یان لە یارمەتیدانی مەلیك مەحموود و حکومەتە ساواکەی؟ چۆن قەڵەم لەم دەرفەتە کەمەدا دەتوانێت ئەو هەموو لێکۆڵینەوە و دراسات و فەرهەنگۆکە دەوڵەمەند و ئەکادیمییانەی هەڵسەنگێنێت؟ دەبێت بوترێت نرخاندنی ئەم توانا فرە مەودایەی تۆفیق وەهبی بابەتی تێزێکی دکتۆرایە بۆ خوێندکار، هەر بۆیە بەندە ئەوەندەم بە باش زانی کە تیشکێکی ڕاگوزاری بخەمە سەر هەندێك لایەنی زمانناسی و مەوداکانی تر جێ بهێڵم بۆ قەڵەمە ئازیزەکانی تر.
ئەم زانا بلیمەتە هەر لە سەرەتاوە بە دوای قەواڵەی نەتەوەیی کوردا گەڕاوە و وێڵی ساخکردنەوەی سەرچاوە و ئەسڵ و فەسڵی کورد بووە، دیارە تانەی نەیارەکانی کورد ئازاری هەمیشەیی بە دڵی گەیاندووە، لە لایەك مەسعودی لە (مروج الذهب)دا وتویەتی ئەسڵی کورد دەچێتەوە سەر جنۆکە! کولەینیش فەرمویەتی! نە ژن لە کورد بێنن و نەژنیشیان بدەنێ، چونکە نەوەی خراپیان لێ دەکەوێتەوە، خۆ لە باکوریشەوە بە کوردیان وتوە تورکە شاخاویەکان، دیارە لەوەها دۆخێکی زاڵمانەدا، دەبێت چەکی پیرۆز بەرگری، بۆ یەکێکی وەك تۆفیق وەهبی، هەر بیری ڕووناکی سەلمێنەر و زانیاری مێژوویی و ڕاستی ڕووداوەکان و دۆکۆمێنتی فرە لایەن بێت.
یەکێك لە کارەکانی تۆفیق وەهبی سەلماندنی ئەو ڕاستییەیە کە کورد دەگەڕێتەوە سەر مادەکان و بە نەتەوە هەرە دێرینەکانی ڕۆژهەڵات دەناسرێت. تۆفیق وەهبی هەندێك ڕاو بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناس، مەکەنزی پووچ کردۆتەوە، کە گوایە بەڕای ئەو، کورد بۆیە خۆیان بەستۆتەوە بە مادەکانەوە، بۆ ئەوەی لەو نێوانەدا ڕابووردوویان پتەو و مسۆگەر بکەن، نەك هەر ئەمە بە تەنیا، بەڵکو پەرچی گەلێ ڕای تری مێژوونووسانی تریشی داوەتەوە کە گوایە کوردیان لە بە نەتەوە بوون و ڕەسەنایەتی خۆرهەڵاتی سفر کردۆتەوە. مەکەنزی زمانی خۆرهەڵاتی بە بەشە جیاجیاکانیەوە بە باشی نەزانیوە و نەیتوانیوە لەو نێوانەوە سوود لە پەیوەندییە زمانییەکان وەربگرێت بۆ ساغکردنەوەی کێشە نەتەوەیی و بنەچەییەکان، جگە لەمەشیان ڕای وایە کە زمانی کوردی لەژێر کاریگەرێتییەکی ڕاستەوخۆی فراوانی زمانی فارسیدایە، بەڵام تۆفیق وەهبی بە نەفەسی زانایەکی خاوەن میتۆد و ڕێسای زانستیانە، بۆچوونەکانی بۆ ڕاست دەکاتەوە و دەڵێت لەبەر ئەوەی کە ئاڤێستا بڕبڕە پشتی زمانی کوردییە و لە هەمان کاتیشدا تێکستێکی ئایینی پیرۆزە، واتە بنەوانە مێژووییەکەشی لە زمانی پەهلەوی کۆن بەهێزترە و سەرچاوە و لایەنە فۆنەتیکیەکانیشی ڕەسەن و پێگەییو ترن، ئەوەی کە بۆچوونەکانی ئەم زانا جوامێرەی کوردی، بە گوڕ و هێز کردووە و کردویەتییە جێگای متمانەمان، قووڵ داچوون و پەنا بردنە بەر سەرچاوە مێژووییە دێرینەکانە، نەك هەر ئەمەش، بەڵکو تۆفیق وەهبی زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی و پارسی کۆن و پەهلەوی و هەموو دیالێکتە کوردیەکانی وەك کرمانجی خواروو، سەروو گۆرانی و لوڕی و زازایی بە باشی زانیوە، هەوڵی فرەیشی داوە کە ئەم دیالێکتە کوردییانە بە میتۆدی گەشەسەندن و گۆڕانکاری لە وشە و دەستەواژەدا، لەو هەلومەرجە سیاسی و ئیداری و ژیارییەی ئەو دەورانەدا، چوارچێوەیەکی کوردانە بگرێتەخۆ، نابێت ئەوەش

لەبیر بکرێت کە تۆفیق وەهبی مامەڵەی لەگەڵ ئەم بابەتە گرنگەدا، وەك زانایەکی خاوەن میتۆد و پرۆگرام ئەنجامداوە، یەکێك لە بناغەی میتۆدەکانی لەم بوارەدا بەراوردێکی هونەرییە، لە نێوان فۆنەتیك و هەڵاویردنی هەندێك فۆنیم و گۆڕانکاری لە نێوانیاندا، وەك حاڵەتێکی (صرفی)، لە هەندێ بواری تردا هەوڵی داوە لەگەڵ گەشەسەندنی وشەدا پێ بە پێ گۆڕانکاری فۆنیمەکانی دەربخات، واتە مێژووی گۆڕانکاری خۆڕسك لەوشەدا پیشان بدات، ئەم پرۆگرامە لەمیتۆدی فەرهەنگی ئۆکسفۆڕدا بەدی دەکرێت و لە نێو عەرەبەکاندا (ابن جنی) هەوڵی لەم جۆرەی هەیە، چونکە بەپێی ئەم تیۆرە زمانییە، وشە وەك هەر بوونەوەرێك هەمیشە لە دۆخی گۆڕاندایە.

لە دواجاردا تۆفیق وەهبی سەلماندویێتی کە زمانی کوردی بەچکەزای زمانی هەرە دێرینەی ئاری و ئاڤێستایی و مادەکان و لەوێوە سەرچاوەی گرتووە و ڕاکانی مینۆرسکی لەم بوارەدا بە زانستانە تر دەزانێت لە بۆچوونەکانی مەکەنزی، هەوڵەکانی تۆفیق وەهبی لەوەدا دەدرەوشێنەوە کە یەکێتی کورد وەك نەتەوە، لەسەر ئەو بنەمایە بنیات نراوە، کە دەگەڕێنەوە سەر مادەکان و بنەوانە زمانی و ئەتنیکیەکەیان لە قووڵایی مێژووی خۆرهەڵاتەوە سەری دەرهێناوە.

مامۆستا تۆفیق وەهبی شارەزا و پسپۆڕێکی ئێجگار فراوانی زمان و مێژوو و ئایینە جۆر بەجۆرەکانی خۆرهەڵاتە و لەو بوارەدا جێ دەستی دیار و درەوشاوەیە، پێ بەپێ بە دوای کۆچی تیرە و هۆز و شەپۆلە مرۆییەکانی هیند و ئەورووپییەکانەوەیە، بەتایبەت ئەوانەی کە لە کوردستان و ئێراندا ماونەتەوە، بە دور و درێژی و پشت بە سەرچاوە بروا پێکراوەکان، لە بنەما ئایینیە دێرینەکانی کوردی کۆڵیوەتەوە، ئەوەندەی بەڕێزیان بە وردی و هۆشیارییەوە باسی بنەچە و سروشتی ئایینی و هەڵسەنگاندنی قەواڵەی یەزیدییەکانی کردووە، کەس نەیکردووە و تەنانەت ئەوانی بە تەوەری توند و بەهێزی نەتەوەیی کورد ناوزەد کردووە و لە پەنای ئەمەشدا لەسەر ڕووبەرێکی جوگرافی دیار و ڕوون، شوێنی کۆچ و نیشتەجێ بوون و شەڕ و شۆڕ و مەزاری شێخ و پیرەکانیانی بە وردی دەستنیشان کردووە و زانیارییەکی فرەی لە سەرچاوە مێژووییە باوەڕپێکراوە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکانەوە وەرگرتووە، ئەمە جگە لەوەی کە بۆچوون و دەرەنجامە تایبەتییەکانی خۆی، هێندەی‌تر توێژینەوەکانی دەوڵەمەند کردووە و بۆتە سەرچاوەیەکی زانستیانەی بڕوا پێکراو بۆ توێژەرەکانی داهاتوو. با ئەوەش نەبوێرم کە تۆفیق وەهبی ڕای وایە کە زوڵمی بێ بنەما لە یەزیدیەکان کراوە و هەمیشە قوربانیی دواکەوتوویی دەوروبەرەکەیان بوون لە نەخشەی ئاینزاکانی خۆرهەڵاتدا، بە تایبەتی لەوڵاتی ئێرانی ئەوسادا، وەك تۆفیق وەهبی ڕونی کردۆتەوە، یەك جۆر ئاین و بیر و بڕوا و سروت نەبووە، بەڵکو جۆرێك لە ڕیزبەندی ئاینی بۆ قۆناغ و شوێنەکان دەست نیشان کردووە و ئاینی زەردەشتی کردۆتە ئاینی سەرەکی ئەوسای کورد و ئەوەشی سەلماندووە کە بنەماکانی ئەم ئاینە هەمیشە داوای چاکە و خێر و بوژانەوە و ئاوەدانکردنەوەی سروشت و دوورکەوتنەوە لە ئازاردانی مرۆڤ و شەڕ و شۆڕ و.... هتد، دیارە هەموو ئەم ئەدگارانە و تەبلیغات کردن بۆیان لە کۆمەڵگەیەکدا بووە، کە لە قۆناغی شەڕانگێزی و پێکدادانی هەمیشەیی و داگیرکاری و بەرگریدا بووە، هەر بۆیە زەردەشت لەو دەورانە پڕ لە ناسەقامگیرییەدا، داوای نیشتەجێ بوونی هۆز و تیرەکانی کردووە، بۆ ئەوەی مەشغوڵ بن بە ئیش و کار و کشتوکاڵەوە و دوورکەونەوە لە کۆچ و کۆچباری کە سەرچاوەی ناسەقامگیری و دوواکەوتن و شەڕ و شۆڕ ە، واتە بیر و ڕاکانی زەردەشت هەڵقوڵاوی ناخی ئەو کۆمەڵگەیە بووە بەتایبەتی لە بواری چارەسەرکردنی کێشەکانیاندا بە سیمبولی ئاهورامەزدا. ئەوەی کە توانای لە بن نەهاتووی ئەم زانا گەورەیەی کورد دەسەلمێنێت، ئەو فرە مەودایییەتی لە پسپۆڕی لە بوارەکانی، مێژوو، ڕێزمان، زمان، کۆمەڵگە، پەروەردە، ئاین، شوێنەوار، جوگرافیا، زانستەکانی جەنگ، نەك لە چوارچێوە ئامادەکراوەکەیدا، بەڵکو لە گەڕان

بەدوای سەرچاوەکاندا لە زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی و عەرەبی و فارسیدا و دانانی تەلارێکی تیوریزەی باوەڕ پێکراو بۆ نەتەوەی کورد.
ئەو سەرچاوە بیانییانەی کە تۆفیق وەهبی لە کون و کەلەبەری کتێبخانەکاندا دۆزیویەتیەوە و کاری لەسەر کردووە، بوونەتە هەوێنی ئەو هەموو توێژینەوە زانستیانەی کە کتێبخانەی کوردی لەو بوارانەدا دەوڵەمەند کردووە، نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کە زۆرجاران هەڵەی ڕۆژهەلاتناسەکانی بە بەڵگەی سەلمێنەر ڕاست کردۆتەوە، یان زانیاری نوێی خستۆتە سەر، یان داهێنانی لەپاڵدا کردووە.
میتۆدی توێژینەوە زانستییەکانی تۆفیق وەهبی، لە بوارە جیاجیاکاندا چوون یەك نییە و بۆ هەر بوارێك پرۆگرامی تایبەتی گونجاوی خۆی بۆ چێ کردووە، واتە مەنهەجی توێژینەوەی زمان، جیاوازە لە مەنهەجی ساغکردنەوەی ڕووداوە مێژووییەکان، یان دابو نەریتە کۆمەلآیەتییەکان، یان ناسینەوەی شوێنەوارەکان... یان.... یان... هتد.
خاڵی هاوبەش لە چێ کردنی دەرەنجامی توێژینەوەکاندا، شیکردنەوە و بەراوردی دەق و کەرەستەکان و دواجار ڕای تایبەتی خۆشیەتی، کە هەمیشە دەدرەوشێتەوە و کەسایەتییە زانستییەکەی بەرجەستە دەکات، واتە هەر سەرچاوەی ئەم لاولای لێك نەداوە و بە کەڵەکە کراوی بۆ خوێنەری جی بهێڵێت، جار هەبووە لە بەشەوە (جزء) چووە بۆ گشت (کل)، جاریش هەبووە بە پێچەوانەوە، بۆ توێژینەوەی بوارەکانی زمان و گەشەسەندنی واتا و گۆڕانکاری لە بونیادی ڕستە و وشەدا، میتۆدی پەرت (تحليل) کردنی جومگەکانی وشە و دەستەواژەی پیادە کردووە و لە ئەنجامدا چۆتە سەر لێکدان (تركيب)، دیارە زانیاری فرەی تۆفیق وەهبی، لە بواری ڕۆنانی وشەدا، یارمەتی فرەیان داوە بۆ ڕاست و ڕەوانی ئەنجامگیرییەکانی، با ئەوەشم لەیاد نەچێت کە ئەم زانا گەورەیە، لە گەنجینەی مێشك و بیرەوەرییەکانیدا زۆرترین موفرەداتی کوردی ڕەسەن و سەر تەڵی گرتۆتەخۆ.
سەرامەدێتی و پێشەوایەتی تۆفیق وەهبی لە دەوڵەمەند کردنی کولتووری زمانی کوردیدا، لایەنێکی تری نەمرییەکەیەتی، زۆر بابەت هەبووە پێش تۆفیق وەهبی ڕۆشنبیرە کوردەکان پەییان پێ نەبردووە و تەنانەت ئاگاشیان هەر لێی نەبووە، هەر ئەم کەڵە زانایە بوو، کە دەرگای لەسەر زۆر بابەت کردەوە و ئێمەی پێ ئاشنا کرد، دیارە یەکێك لە هۆکارەکانی ئەم سەرامەدێتیە، ئاشنایەتی تۆفیق وەهبی بوو لەگەڵ کتێبخانە بیانییەکان و بەرهەمی بە بڕشتی ڕۆژهەلاتناسەکان بە زمانەکانی ئینگلیزی و ئەڵمانی و فەرەنسی و عەرەبی و فارسی.
لەبواری ڕێزمانی کوردیدا دەشێت هەموومان لەبەردەم توانا و داهێنانەکانیدا بنووشتێینەوە، چونکە زمانی کوردی بە بارە ئەکادیمییەکەیدا خستە سەر سکەی ئاسایی خۆی و بێ خەمی کرد، چونکە زمان هەرچەندە موفرەداتەکانی فرە و دەوڵەمەند بێت، ئەگەر زانستەکانی ڕێزمان (نحو – صرف) بە یاسا ڕێکی نەخات و ڕستەسازی بۆ فەراهەم نەهێنێت، بەرەو پووکانەوە دەچێت، لە هەڵدانەوەی ژمارەکانی گۆڤاری گەلاوێژدا جاروبار

دیاردەی (اعراب) کردنی بەیتە شیعرێکی کوردی دێتە پێش چاومان، لەسەر یاسا و ڕێسای زمانی عەرەبی، وەك دەستنیشانکردنی (فعل، فاعل، مفعول بە، ظرف)، ئەم دیاردە نامۆیە لە زمانی کوردیدا جێگای مەترسی گەورە بوو بۆ داهاتوو، چونکە لە بونیادی زمانی کوردیدا دیاردەی (سەر، بۆر، ژێر) واتە (فتحة، ضمة، کسرة) نییە و بەتەنیا تایبەتە بە زمانی عەرەبی و لەگەڵ زمانی کوردیدا نایەتەوە، ئەو پرۆگرامە ورد و پڕ سەلیقەیەی تۆفیق وەهبی لەمەڕ ڕێزمانی کوردی بووە قەواڵەیەکی بڕوا پێکراوی ئەوتۆ کە کەس نەتوانی لێی لابدات، نەك هەر ئەمە بەتەنیا، بەڵکو بووە ئەو بناغە تووند و تۆڵەی کە لە دوای خۆی تەلاری بنەماکانی ڕێزمانی کوردی لێ ڕازێنرایەوە و بێ خەمی کردین، واتە سنوورێکی پۆڵایی بڵندی دانا، لە نێوان بەکار بردنی یاسا و ڕێسای زمانی عەرەبی لە نێو زمانی کوردیدا. ئەو لێکۆڵینەوە بە بڕشت و فرە مەودایەی تۆفیق وەهبی لەسەر خێڵ و تیرەکانی (گۆران و باجەلان) ئەنجامی داوە، لە ڕووی جواگرافیا و ئایین و هەڵس و کەوت و دیالێکتی قسە کردن و دابو نەریت و سەرچاوەی بنەچەکانیانەوە، هێند دەوڵەمەند و زانستانەیە کە تا ئێستا هیچ کوردێك نەیگەیشتۆتێ، تەنانەت بۆتە سەرچاوەیەکی ڕوون و گەش بۆ توێژەرەکانی دوای خۆی، ئەو سەرچاوە دانسقانەی کە بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی و فارسی سوودی لێ بینیوە، ئێجگار دەگمەن و بەڵگەی ماندوو بوون و کێوماڵ کردنی کتێبخانەکانە، خۆ ئەگەر ئەو نەبوایە زۆر بە درەنگ، یان هەر نەدەگەیشتینە ئەو سەرچاوانە، بەڕاستی ئەمەیە خەسڵەتی زانای گەورە و نەمر لە مێژوودا، چونکە هەمیشە سەرامەد و داهێنەری یەکەم و پشوو درێژن بۆ کارە نەمرەکانیان.
لە بواری دەستنیشانکردنی شوێنەوارە کوردییەکاندا، هێندەی تر خۆی ماندوو کردووە و بە بەشێك لە مێژووی شارستانی کوردی ئەژمار کردووە، میتۆدی ئیشکردنی تۆفیق وەهبی لەم بوارەدا بریتییە لە پشت بەستن بەسێ بنەما:
١- ڕای ڕۆژهەڵات ناسەکان
٢- ڕای تایبەتی خۆی، چونکە وەك ئاسەوار ناسێك شوێنەکانی لە نزیکەوە بینیوە و بە وردی وەسفی کردووە و لێی کۆڵیوەتەوە، لە نێوان بەراوردکردنی بۆچوونە جیاوازەکاندا، زۆرجار هەڵەی شوێنەوارناسەکانیشی ڕاست کردۆتەوە.
٣- نرخاندنی شوێنەکانی بەستۆتەوە بەو تیرە و هۆز و گەلانەی کە لەو شوێنەدا ژیاون و دەسیان هەبووە لە بونیادنان، یان پاراستن، یان کاول کردنیان دا، واتە هەوڵیداوە لەم چوارچێوەیەدا مێژووی شارستانی ناوچەکانی کوردستان چێ بکات، دیارە ئەم پرۆگرامە زانستیی و بابەتییە، ئەو توێژینەوانەی هێندەی تر دەوڵەمەند و پڕ بایەخ کردووە، با ئەوەش لەیاد نەکەین کە داد و بێدادی بووە لەوەی

که میللەتی کورد ڕێز لە شوێنەوارەکانی ناگرێت و دەرك بەوە ناکات کە ئەم ئاسەوارانە بەشێکی زیندوو و بەڵگە نەویستن لە مێژووی وڵاتەکەی. لە ساغکردنەوەی ناوی شارەزوور، قەڵاچوالان، کەرکوك، الزاب خرناباد، بهرز، بلدروز، بێستون، بغداد... هتد.
سەری کردووە بە گەلێ سەرچاوەی جۆر بەجۆردا و ئارەقەی بۆ ڕشتووە، ئەوەی کە یارمەتی فرەی داوە بۆ ساغکردنەوەی ئەم شوێنانە، ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەیە لە بواری زمان زانیدا، بە تایبەتی زمانەکانی ئاڤێستایی، پەهلەوی، فارسی کۆن، ئەمە جگە لە زمانی دەوڵەمەندی کوردی بە هەموو بەش و دیالێکت و چڵ و پۆپەکانیەوە، نابێت ئەوەش لەبیر بکرێت، کە ئەم شوێنانەی بەستۆتەوە بەو تیرە و هۆز و گەلانەی کە تیایاندا ژیاون، واتە بە کورد بوونی ئەم شوێنانە یەکێك بووە لە مەبەستە سەرەکییەکانی، دەرهاویشتەکانی ئەو پێش بینییەی تۆفیق وەهبی، ئێستا لە شوێنە جێناکۆکەکانەوە سەر دەردێنێ، کە کاربەدەستانی بەغدا شەڕیان لەسەر دەکەن و بە خاکی عەرەبی دەزانن!!
وتارە زانستییەکانی تۆفیق وەهبی لە گەلاوێژ و دەنگی گێتی تازە و دیاری کوردستان ١٩٢٤ — ١٩٢٥ گەواهیی ئەو هەوڵە شێلگیرانەیەتی لە بواری دەوڵەمەندکردنی زمان و بوارەکانی ڕێزماندا.
بەپێی بەراوردکردنی هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی لەڕووی پێکهاتە و فۆنیمەکانەوە، گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە ئەو خەتەی زمانی عەرەبی پێ نووسراوەتەوە، پیتەکانی بەشی زمانی کوردی ناکەن و هەندێك دەنگ هەیە پێویستییان بە پیتی تایبەت، یان هێما هەیە، هەر لەبەر ئەوە بوو دوای ماندوو بوونێکی زۆر کۆمەڵێك هێمای بۆ خەتە عەرەبییەکان داناوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ زمانی کوردیدا بگونجێت، بەڵام شۆڤێنییە عەرەبەکان و خەڵکێکی تر لێیان کردووە بە هەڵڵاو نەیان هێشتووە پرۆژەکەی سەربگرێت، هەر بۆیە ئیتر نەیتوانیوە باسی بەکارهێنانی پیتی لاتینیش بکات، مامۆستا تۆفیق وەهبی ئەم ئەرکەی خستە ئەستۆی کۆڕی زانیاری کورد و داهاتووی نووسینی کوردی و دڵسۆزانی میللەتەکەمان.
نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت، لەبارتەقای ئەو ڕێگریەدا کە لێی کراوە کۆڵی نەداوە و لە پەیجۆری ئەوەدا بووە، کە بەکارهێنانی زمانێکی کوردی ڕەسەن بکاتە دەستە گوڵی نووسین و لەو بوارەدا کاری گەورە و سەرامەدی ئەنجامداوە، وەك توێژینەوەکانی (دەستوری زمانی کوردی لە ١٩٢٩) دا، (خوێندەواری باو ١٩٢٣)، (فەرهەنگی گەلاوێژ)، هەروەها کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی زمان و ڕێزمانی لە گۆڤاری گەلاوێژ و دەنگی گێتی تازە و پێشکەوتن بڵاوکردۆتەوە.
با خوێنەری ئازیز ئەوەش بزانێت کە ئەو خەتەی ئێستا عەرەبەکان بەکاری ئەهێنن، داهێنانی خۆیان نییە و کۆمەڵێك ڕای جیاواز هەیە لەسەری، هەن دەڵێن هی کەنعانییەکانە، هەند دەڵێن هی قیبتییەکانە... یان لیحیانییەکانە... یان...ئارامییەکانە... یان مامۆستا تۆفیق وەهبی، هەمیشە لەگەڵ ئەوەدا بووە کە ئەگەر لە جیاتی وشەیەکی عەرەبی، یان فارسی بەکارهاتوو لە زمانەکەماندا، وشەیەکی کوردی ڕەسەن لە هەر شێوەزارێکی تری کوردیدا هەبێت وەك (کرمانجی سەروو، گۆرانی، لوڕی، زازایی)، دەشێت لەجیاتی ئەو بەکاربهێنرێت، بە مەرجێك لە چوارچێوەی ڕێزمانی کوردی دەرنەچێت، دەشێت ئەم بۆچوونە سەرامەدە، یەکەمین بەردی بناغەی زمانی یەکگرتووی کوردی بێت، کە تا ئێستا ئەفسوس!! نەمان توانیوە فەراهەمی بهێنین، هەروەها بە لایەوە ئاسایی بووە بەکارهێنانی وشەیەکی بیانی کە لەکۆنەوە بەکارهاتووە و وەك کوردی لێهاتووە، واتە کوردێنراوە، بەڵام ئەوەی پێ باش نەبووە کە لە جیاتی وشەی (زمان)، (زبان یان زوان، یان ازمان، یان عزمان) بەکاربهێنرێت، هەر لەبەرئەوەی کە فۆنیمەکانیان نزیکن لەیەك.

**تێبینی: بۆ نووسینەوەی ئەم بابەتە سوود لە کتێبی (تۆفیق وەهبی) - الاثار الکاملة بینراوە.**

# تۆفیق وەهبی
# کوڕی پیرەمەگروون

کەمال رەئووف محەمەد

شێخەکەی گڵەزەردە، شایەتە کە ڕۆژی — یەك شەممە -١٩٨٤/١/١٥، هەرچەندە ڕۆژێکی سەرەتای چلەی زستان بوو؛ ڕۆژێکی مێژوویی بوو، چونکە پیرەمەگروونی دێرین و پیرۆز، وەك ساڵان، بەرگی ماتەمینیی نەپۆشیبوو.. نەوجووان و پیرەکانی کوردستان و سلێمانیی گەرەکی؛ وەك پڵنگ بەچیادا هەڵدەگەڕان.. دڵ گەرم، یەك بوون: بە لێدانی دڵ، بە هەناسە، بە تەماشا، بەبڕوا.

دیارە پەنهانییەك هەبووا تۆ بڵێیت خەم بووبێت؟ من باوەڕ ناکەم، بەڵکو دەڵێم؛ هەموو لە ئاهەنگێکدا بوون — کە بۆنی هەزاران ساڵی پێشووی لێدەهات — بۆ ناشتن نا، بۆ پێشوازیی پرشنگێکی ڕۆژی پێشکەوتن کە هاتەوە لای — باپیرە گەورەی — کە چەند ساڵ بوو، بە جەستە، نەك بە گیان، لانەواز بوو.

من، هەرگیز — با جەستەیشم لە چنگی هەژدەهاکدا بێت کە لەو ئاهەنگەیشی کردم — بیرم توانای بڕوای نییە کە "ڕووناکی" دەکوژێتەوە، چونکە ئەوەتا، پیرەمەگروون هەر لەشوێنی خۆیدایە و سەرکەشە. کاروانی ڕۆڵە دڵسۆزەکانیشی، ئازا و زاناکانی هەر ڕێچکە دەبەستێت کە تۆفیق وەهبی —یش مەردێکی ئەو کاروانە گەورە و بەهێزەیە.

تۆفیق وەهبی، کە نزیك سێ چارەکە سەدەیەکە، بە بەهرەی گیانی، کێوی قافی مێژوو هەڵدەکۆڵێت و لێی دەنووسێت "ئێمە کورد زمانی پیرەمەگروونین" ئەو — تەوفیقە - بەوەش نەوەستا، بەڵکو کە ڕۆژی ١٩٨٤/١/١٥ لە - لەندەن - دا دڵی جەستەی لە گیانەڵادا بوو، بەدوا هەناسەیشی دوا وشەی نووسی کە وەسیەتی کرد؛ بچێتەوە ئامێزی "پیرەمەگروون".

ئا ئەو یەکبوونە، بەو بەرزییەوە بەرامبەر بە ڕۆژ، بە ڕاستی "نەمرێتییە".. خۆزگەم بە خۆی.

-١-

هەڵەیەکی دیارە بڵێین؛ دوای جەنگی جیهانگیریی یەکەم ڕاپەڕینی ڕۆشنبیریی کوردی دەستی پێکردووە. ڕاست ئەوەیە؛ کە ئەو —مەودایە -درێژەی ڕاپەڕینە نەتەوەییە تەواوەکەیە کە پاش دەوری مەشروتییەتی تورك (= ١٩٠٨) دەستی پێکردووە، نەك هەر لەلای کوردەکان، بەڵکو لەلای عەرەبەکانیش.

پیرەمێردی شاعیر و دنیا دیدە، لە ١٩٣٢دا ئەوەمان دەخاتەوە بەرچاو کە دەڵێت: (.. کە ئەوان گوتیان؛ ئێمە تورکین، ئەوسا هەموو میللەتەکانیتر، سێ چەندانەی ئەوان بوون، ئەوانیش گوتیان؛ کەوابێ ئێمەیش عارەبین، یا کوردین، یا فلانین.. ئینجا ئەو سەردەمە، کوردیش کەوتە خۆی. لە ئەستەموولا و لە هەموو لایەکدا، کۆمەڵ کۆمەڵ کەوتنەیەك "لەلایەك/ ك. ر. م" لە شوێن ڕیشە و کردەوە و پیشەی باو و باپیری خۆیان گەڕان"لە لایەکی ترەوە/ ك. ر. م" لە هەموو کتێبە یاداشتەکانی ئەورووپادا، هەر شتێکی دۆزییەوە وتی؛ کورد ئەمەیە.)

هەڵبەتە -بەمەدا — دیارە کە بزووتنەوەکە گشتیی بووە کە سەرەنجام، یەکەم کۆمەڵەی سیاسی کورد "کورد تەعاون و تەرەقی" و ڕۆژنامەکانی — بەناوەوە — لەپاش شۆڕشی ١٩٠٨ی بنەماڵەی شەمزین و بەدرخان، دامەزرا.

ئەمجا کۆمەڵی "هێڤی — ١٩١٠ ئەستەمووڵ"و گۆڤاری "ڕۆژ کورد -١٩١٣ ئەستەمووڵ" و گۆڤاری بانگی کورد ١٩١٤ بەغدا"و گۆڤاری "یەك بوون — ١٩١٥ حەلەب"و گۆڤاری "ژین — ١٩١٨ ئەستەمووڵ".

ئەو ڕاپەڕینە ڕۆشنبیرییە -وەك ڕاپەڕینی عارەبەکان — کە بەڕەگ و ڕیشەوە - با هەر دەم ئاشکراش نەبووبێت — بەسترابوو بە ڕاپەڕینی سیاسییەوە، بە کۆمەڵەکان و چاپەمەنییەکانەوە، بە گەرمییەوە وەك یەکەم ڕۆژنامەی کوردی "کردستان — ١٨٩٨: قاهیرە ژنێڤ" بانگیان دەدا بۆ ڕاپەڕینی "خوێندەواری" یان بە واتایەکی تر، وەك "ڕۆژ کورد" گوتوویەتی: " بەری شیر قەڵەم".

قەڵەم کە بیر دەیبزوێنێت، لە چ بارێکدا بوو؟

کوردستان، سەرانسەری، ژێر دەستەیی ستەمی دەوڵەتی عوسمانیی یان ئێرانیی بوو کە لە لایەك ڕۆشنبریشیان کارێکی چەوساندنەوەی دەگێڕا و "زمانی کوردی" نووسینی باو نەبوو، گوایە " کوردلردەلسان رسمی یوقدر = کورد زمانی ڕەسمی نییە!" یان "کوردی لەهجەیەکی فارسییە!" لەولاوەش میللەتەکە نەخوێندەوار بوو.

ڕاستییەکەی بزووتنەوە ڕۆشنبیرییەکە دەبوو — وەك وایش بوو — چاو ببڕێتە دوو ئامانجی گەورە:

یەکەم — نووسین بە کوردی و کۆشش بۆ دانانی دەستوور و فەرهەنگ بۆ زمانی کوردی، بۆ بڵاوبوونەوەی خوێندەوارییەکی نوێ.

دووەم — بووژاندنەوەی هەموو ڕوویەکی — مێژوو،

کردەوە، خوو و نەریت، بۆ وریا بوونەوە و خۆناسینەوەیەکی نوێ.
ئەمە ئاسان بوو؟ کە کێشەی گەورە گەورە بە بەرچاوی بزووتنەوە ڕۆشنبیرییەکە و خەڵکەکەشەوە بوو.. ئەو سەردەمە دوو دەستە سەرمایە بوون؛
یەکەمیان: مەلا ڕۆشنبیرەکانی دەستەمۆی ڕۆشنبیریی کۆنی چەند سەد ساڵە. دووەمیان: لاوە ڕۆشنبیرەکانی دەرچووی قوتابخانە عوسمانییەکان. یەکەمیان جێگایەکی سەختی هەبوو. دووەمیشیان — شپرزە - نەیدەزانی — لەنووکەوە - بۆ قۆناغێکی نوێ و ناسك، چۆن ڕێنووسێکی کوردی بگرێت، تاوێك ڕێنووسی دەستەی یەکەمی گرت، تاوێکیش پەلی دەکوتا بۆ داهێنان — وەك نیشاندانی پیتەکانی: (ڕۆژ کورد — و بانگی بۆ ڕێنووس — یان لاسایی کردنەوەی ڕێنووسی "لاتینی"ی کە باسی دێت؛ کە ئەمەی دوایی بۆ خەڵکەکە بارێکی گران بوو.!
لە گەرمەی ئەو باخی هیوایەدا، جەنگی جیهانگیری یەکەم هەڵگیرسا و سێ بەشی کوردستانی گرتەوە کە زیاد لە نیو ملیۆن شەهیدی داو سەر ئەنجامیش برسێتی و نەخۆشی و بێ دەرامەتیی دەستگیر بوو، لە سەرو ئەو کارەساتانەشەوە، هەژدەهاکێکی تری لێ هار بوو کە ئینگلیز و سیاسەتە گڵاوە تاوانبارەکەی بوو.
تۆوە کوردی ئەو باخە، دوای ئەو جەنگە شوومە، لە کوردستان — ی عێراقدا، لە ١٩١٩ەوە کەوتەوە پەلاماری ڕۆشنبیران، بەڵام دیسان کێشەی ڕێنووس و دەستوور و فەرهەنگی زمانی کوردی لەسەری ڕێگادایە، بەربەرەکانیش لەبەرامبەرە. هەڵبەت دەبوو چارەیەك بدۆزرێتەوە!. لە ١٩٢٠دا — بەشی زۆری ڕۆشنبیرە دووەمەکە هاتبووەوە - کە ئینگلیزەکان ڕۆژنامەی "پێشکەوتن —سلێمانی"ی دامەزراند. ئەو دەستە دووەمە کەوتەوە خۆی- بە هاریکاری هەندێك هوشیاری یەکەم دەستە - و بە ڕێنووسی جاران، بەڵام بە کوردی، کەوتنە نووسین، تەنانەت داهێنانی نووسینی پەتی و بڵاوکردنەوەی پەخشان — بە گوتار و هەواڵ و چیرۆکی وەرگێڕاو و بەسەرهاتی مێژوویی کورد و لێکۆڵینەوەی گیروگرفتەکانی کشتوکاڵ و کۆمەڵایەتی —و شیعریش، ئەمە جگە لە باسی هاندانی جەماوەر بۆ خوێندەواری.
بۆ ئێرە، دوو بانگی ڕۆشنبیری گەورە، لەنێوانیاندا کاریگەر بوو:
یەکەم: بانگ بۆ دانانی ئەلفبای کوردی. کە بەڵگەش گوتارەکەی ٢٤ی شوباتی ١٩٢١ی: م. نوری - یە (= شێخ نوری شێخ ساڵح) کە دەڵێت: "ئەم حەرفانە لە کوردیا لە هەندێ جێگادا پێویستە بگۆڕرێت. بۆ

**تۆفیق وەهبی، تەحسین بابا شێخ**

خاطر ئەمە چاك و باش بخوێنرێتەوە تكا لە بیردارەكان و قەڵەم بەدەستەكان ئەكەم كە بۆ ئەم حەرفانە عەلاماتێكی فاریقە، یەعنی نیشانەی جوێ بوونەوە بدۆزنەوە!"، كە ئەمەیش شێوەیەكی بانگەوازەكانی دوای ١٩٠٨ بوو. جگە لەو وێنەیەش، بە یادی( ١٩٢٠) ەوە گۆڤاری دیاری كوردستان — ١٩٢٥، وێنەیەكی ترمان دەخاتە بەرچاو كە دەڵێت: (مێجەر سۆن تەسەور و دەرسێكی مەخصوصی بەناوی كوردیی بە حەرفی لاتینی نووسین خستبووە مەكتەبەكانی ئەم ناوە. ئێستاش كتێبێكی مەطبوعی ئوصول و تەعلیم و قیرائەتی ئەم دەرسە ماوە كە محەمەد زكی افندی بەدبەخت و محەمەد بشكە "باشقە/ ك. ر. م" افندی نووسیویانە).
ڕاستییەكەی، كێشەیی ڕێنووس، دوو دەستەی وریای لێ بووەوە. یەكەمیان - گەرچی لە دووەمیش نەپچڕا بوو — لایەنی كوردی نووسین — ی بە لاتینی دەگرت، وەك: تۆفیق وەهبی، حقی شاوەیس — لەسەرەتادا — ئەمجا پیرەمێرد چەندی تر. دووەمیان — لایەنی ڕێنووسی كۆن و دەستكاری كراوی دەگرت، وەك: مەعروف جیاووگ و گەلێكی تر.
دووەم: بانگ بۆ لەبیر نەچوونەوەی زمانی خۆمان و خوێندن كردن بە كوردی و بەرپەرچدانەوەی ئەو هاوارە گڕانەی كە دیسان — لەو (١٩٢١)ە بەدواوە - بە ئاشكرا دەدرا بۆ نەخوێندنی زمانی كوردی لە قوتابخانەكاندا كە بەپەنجە دەژمێرران. بەڵگەی دیاریش بۆ ئەو هاوارە - بە پشتی كۆنە پەرستەكانی ئێرە - قسەی بڵاوكراوەی (سلیم حسون افندی — مفتش منطقەی موصل: ڕۆژنامەی "العراق — ژ ٢٥١ — ٢٣ تشرین ثانی ١٩٢١)ە كە ڕۆشنبیرەكانی كوردستان، دەمو دەست لێی ڕاپەڕیبوون، وەك یەكەمەكەیان: (ڕەسوول ناجی — كویسنجق. ١٩٢١).
ئا لەو ڕۆژگارەوە دەردەكەوێت كە چ ڕێنووس، چ خوێندن بە كوردی، پێویستییەكی مێژوویی بوون.
بەڵام بۆ ئەوە كە دوور نەكەوینەوە، چاكە بپرسین: ئایا ڕێنووس بەبێ دانانی دەستووری زمان كەڵك دەگرێت؟ بەتایبەت كە ڕێنوس شایانی گۆڕین و پێشكەوتنە، بەڵام دەستوور، دەستوورە.
لەپاش دامەزراندنی حكومەتی عێراق، لە لایەك هەروەها دامەزراندنی ئەنجوومەنی مەعاریف و دروست بوونی كۆمەڵی زانستیی كوردانی سلێمانی و كۆمەڵی بژاری كوردی "١٩٢٥ — ١٩٢٦" دەبوو دەستووری زمان دابنرێت. بۆ ئەم ئامانجە، پیر و لاوێك، دوو كەسی بنچینە جودا، هاتنە مەیدانەوە: مەلا سەعید صدقی كابان و ئەفسەر تۆفیق وەهبی.
ئەو دوو دەستوورەش هەتا ساڵانی ١٩٢٨ — ١٩٢٩ ئەمجا چاویان هەڵهێنا، بەڵام چۆن چۆنی؟
یەكەمیان: موختەصەری صەرف و نەحوی كوردی — مەلا سەعید صدقی ی موعەللیمی مەكتەبی ئەووەل كە ئەنجوومەنی مەعاریفی سلێمانی لە چوارەم كۆبوونەوەیدا: ١٩٢٦/٢/١١ بڕیاری پەسەند كردنی دا، هەروەها چاپ كردنی و بڵاوبوونەوەیشی لە قوتابخانەكاندا. دووەمیان: دەستووری زمانی كوردیی — تۆفیق وەهبی. جیزمی یەكەم — ١٩٢٩. بەڵام ئەمیان لە قوتابخانەكاندا نەبوو.. (لە ساڵی ١٩٢٣ دا وەزارەتی مەعاریفی عێراق، بە نامەیەكی ڕەسمیی ڕایسپاردم كە دەستووری زمانی كوردی دابنێم، تا لە قوتابخانە كوردییەكاندا بخوێندرێت. كە دەستم بەكار كرد، بەرەو ڕووی ناتوانایی پیتە عەرەبییەكان بووم بەرامبەر دەنگ و بزوێنەكانی نێو زمانی كوردی كە ئەمەم چاوەڕێ دەكرد. لەبەرئەوە كەوتمە كۆڵینەوەی "فۆنیمات" یان "كۆمەڵە دەنگەكان"ی كوردیی و نیشانە كردنیان بەقەد پێویست، لەگەڵ نیشانە پەیداكردن بۆ پیتە عەرەبییەكان تا توانای بەكارهێنانیان لە خوێندنەوە و نووسینی كوردیدا هەبێت.
كاتێك دەنگەكە بڵاوبووەوە كە پیتەكانی عەرەبی نیشانەیان بۆ دانراوە، لای وەزارەتی مەعاریف قیيامەت هەڵسا.. و دانانی ئەو نیشانانەی لەسەر پیتەكانی قورئان بە كفر زانی و كەس و كاری منداڵانی كوردی ئاگادار كرد و بەو جۆرە وەزارەتی مەعاریف ئەو دەستوورەی پەسەند نەكرد كە كەس نە لەكورددا نە لە بێگانەدا نەیان توانیبووە هاوجۆری دابنێن. لەبری ئەمەش كتێبی — قەواعید —ێكی تر پەسەند كرا كە لەم چەرخەدا شایانی خوێندن نییە.)
زمانەوانەكانی ئەم ڕۆژگارە، لەگەڵ ستایشی ئێمە و ئەوان بۆ مامۆستا كابان سەعید صدقی، بە سەنگی زانستی زمان — هەموویان — ڕابەری دەستوورەكەی تۆفیق وەهبی باس دەكەن. ئێمە لەوە ناكۆڵینەوە، بەڵام، لەو ڕۆژگارە دەكۆڵینەوە كە ئەو دەستوورە چاپ كرا و لە قوتابخانەكاندا جێگای نەبووەوە.. ئایا ئیتر لەلای مامۆستا و نووسەران و ڕۆژنامەی ئەو ڕۆژگارەش ئەوها تەماشا كرا؟

وەڵامی تۆمار — بۆ وێنە - بەم جۆرەیە:
١-ڕۆژنامەی: ژیان — ٢٢ مایس ١٩٣٠ بەدەم باسی ژیانی سەعادەتی وەهبی بەگەوە دەڵێت: "دائیما ئارەزووی خزمەت کردنی میللەتەکەی بووە وەگرامێری کوردی کە هەتا ئێستا بە سوورەتێکی باش نەکرابوو میللەتەکە زۆر ئیحتیاجی پێ بوو، لەلایەن مەشار و ئیلیەوە ڕێك خراوە و ئەم گرامێرە ئەمەندە باش و چاك کراوە کە لەلایەن هەموو موتەخەسیس عیلمی گرامێرەوە لە هەموو لایەکەوە مەزهەری تەقدیر و تەحسین بووە. وە بە سەبەب ئەم گرامێرەوە ماشکیلاتێکی نووسین وە خوێندن لە زوبانی کوردیا نەماوە و ئەتوانین بڵێین بە سەبەب ئەم گرامێرەوە زوبانی کوردی زۆر سەهل بووە و هەموو مناڵێك ئەتوانێ بە موددەتێکی زۆر کەم فێری نووسین و خوێندنی کوردی ببێ. (تێبینی: هەمان ژمارە دەڵێت: ئیملای تازە. ئەمانەوێ ئیتر غەزەتەکەمان لەسەر ئیملا و گرامێرە تازەکەی جەنابی تۆفیق وەهبی بەگ بنووسین. بەڵام لەبەر ئەوەی لە چاپخانەکەمانا بەعزێ حرووفات نییە کە پێویستییەتی، ناتوانین ڕێکی خەین. ئومێد ئەکەین بەرەبەرە بە تەواوی تەتبیقی بکەین.
٢- ژیان — ١٩ مایس ١٩٣٠ بە ناونیشانی "لە سەمای مەعاریفا ئەستێرەیەکی گەش" نووسیویەتی: ئەمجارە لەلایەن ئەحمەد فەندیی عەیزا غاوە لەسەر گرامێرەکەی تۆفیق وەهبی بەگ، قیرائەتێکی "ئەلفبای کوردی" ی ڕێك خراوە وە بەم نزیکانە لە لایەنی خۆیەوە لە مەکتەبی ئوممییەکان دەس ئەکرێ بە وتنەوەی. ئەم ئوسووڵە ئوسووڵێکی زۆر باش وە بە کەلکە وە هەموو کەلیمەیەکی وەکو قسەکردن ئەنووسرێ و هیچ کەلیمەیەکی لە کەلیمەیەکی تر ناچێ و مومائیلیە ئەحمەدە فەندیش لە ئووسووڵی دەرس گوتنەوەی ئەلفبادا شارەزاییەکی تەواو و دەستێکی درێژی هەیە و هیوامان هەیە لە موددەتێکی زۆر کەمدا منداڵە نەخوێندەوارەکان بێ ئەرك و ماندوویتی فێری خوێندەواری ببن.
ئومێد ئەکەین لە سینفە نەخوێندەوارەکان لەسەر ئەم "ئەلفا" تازەیە دەرس ببێژرێتەوە، چونکی زۆر نەفعی لێ ئەبینرێ و بە ئاسانتر و بە موددەتێکی کەم فێری خوێندن و نووسین ئەبن. ئەگەر ئەم "ئەلفبا" و "گرامێرە" کوردییە تازەیە لە مەکتەبە ڕەسمییەکانیشا تەتبیق بکرێ موحەققەق ئیستیفادەی دوو چەندانە ئەبێ.

ئینجا هیوامان وایە وەزارەتی مەعاریفیش ئەم ئوسووڵە داخیلی پرۆگرام بکات و لە مەکاتیبی کوردستانا ئەمر بە تەتبیقی بفەرمووێت. (تێبینی: هەتا چەند مانگێك ڕۆژنامەکە - چەند توانای بووە - پەیڕەوی ڕێنووسی دەستووری زمانی کوردی کردووە، بەڵام پاشان دەستی لێ هەڵگرتووە).
ئەگەر ئەوانە - وێنەی — وەڵامی ئەو ڕۆژگارە بێت، پەسەندە "دەستوورەکە" خۆی دەنگ بکات؛ ئایا لەخۆیەوە دروست بووە؟ لە پێشەکییدا — خۆی — بیرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٣ و دەڵێت: "لەکاتی خوێندنی ئینگلیزیدا کە دەزمایەم زۆر بوو، بە خەیاڵما هات کە دەستوورێکی بچکۆلەی زمانی کوردی بنووسمەوە.". مەوداش هەتا ١٩٢٩ زۆرە، بەڵام بۆچی؟ وەڵامیش لەلای خۆیەتی و دەڵێت: "لە کاتێکدا، ئەوا خەریکی کۆڵینەوەی زمانی کوردیی و نووسینی دەستوورییم؛ دوو شتی گرنگ ڕووی دا کە بەهرەیان دامێ بۆ سەرچاوەی زمانی کوردی بگەڕێم. یەکەم: لەساڵی ١٩٢٥ دا لە کتێبخانەی حەمدی بەگی باباندا، کتێبێکی فەرەنسیم لە بابەت — ڕێزمانی ئاڤێستییەوە - دەست کەوت. هەورەها کتێبی — لێکۆڵینەوەی ئێرانی: دراسات ایرانیە - زانینەکانی ئەمانە ڕووناکی و یارمەتیان دامێ کە لە ڕەگەزی زمانی کوردی بگەڕێم. بەڵام دۆستێکم کە شارەزایەکی گەورەیە لە زانستی زمانەکاندا، ئامۆژگاریی کردم کە - ئێستا — ئەم ڕێگایە نەگرم و چاکتر وایە خەریکی نووسینی دەستووری زمانی کوردی ببم. لەو پێنج ساڵەدا کە دەستووری زمانی کوردیم نووسییەوە، وام هاتە پێش چاو، کە یەکەمجارە زاراوەکانی دەستوور بکەم بە کوردی و توانیشم هەندێکیان بە کوردی لە بری موفرەداتی بێگانە دابنێم.".
دەستووریش، هەرگیز بەبێ ڕێنووسێکی پتەو، یان هەر هیچ نەبێت، بەبێ ناسینی تەواوەتی پیت و دەنگە کوردییەکان، توانا پەیدا ناکات، یان لاوازە. لەبەر ئەم لایەنە، دەبوو درێژە بدرێت بە بڵاوکردنەوەی ڕێنووسی لاتینی، کە بەوە بەشێکی ڕەگەزی زمانی کوردی هەروەها سیفەتەکانی پیت و دەنگە کوردییەکان، زیاتر ئاشنا دەکرا. هەر بۆیەکە، تۆفیق وەهبی، ئەم ڕێگایەی بەرنەدا، هەتا دەڵێت "لەساڵی ١٩٣٣ دا — خوێندەواری باو — م بڵاوکردەوە کە خوێندنەوەی نوێیە، کە چۆن پیتی لاتینی لە نووسینی زمانی کوردیدا بەکاربێت.

ئەو نامیلکەیە گەنجینەیەك بوو بۆ هەندێك موفرەداتی کوردی دارێژراوی من و بە پێی دەستووری زمان، یان بە پێوانەی موفرەداتی کوردی هەڵکەوتوو."
بەڵام نووسین بە لاتینی کە تا ئەم نزیکانەیش درێژەی هەبوو بۆ ئەوە نەبوو کە بپچڕێین لە نووسین بە پیتی عەرەبی کە شوێنی مێژوویی خۆی هەیە. بەڵکو بۆ ئەوە بوو، تەکان بدرێت بە ڕێنووسێکی نوێ و دارشتنی نیشانەی جوداو پەسەند، بۆ خزمەتی زمانەکەمان کە هی هەمووانە.
لە گەلاوێژدا، خۆی لە ١٩٤٣ دا زانایانە دەڵێت "بەرزکردنەوەی زمانەکان، هەر ئەرکی کوردێك نییە، لەسەر هەموو کوردێکە شانی بداتە ژێری. ئیتر چاوەڕوانی بازوو لێ هەڵکردنتانم". ئەمەیشی لە هەلێکدا بوو کە بڕیاری تەواوەتی دا بوو کە هەر بە پیتی عەرەبی بنووسێت. بەڵام چۆن؟
لە چلەکان بەدواوە، دەڵێت "بڕیارم دا هەتا پیتی عەرەبی نیشانەداری دارێژراوی خۆم دانەنێم، هیچ بڵاو نەکەمەوە. هەر بۆ ئەم ئامانجەش لە ١٩٥٦ دا چووم بۆ بەیرووت، سەرپەرشتی دارشتنی پیتی تایبەتی بووم، ئەوی کە - قواعید اللغة الکردیة —م پێ بڵاوکردەوە). لێرەدا دەبێت ئەو ڕاستییە ون نەبێت، کە ئەو بازە مێژووییەی ئەو کە دای بە زمانی کوردی — لەمێژەوە - لاوانی خستبووە سەر ڕێگای کردو کۆشی هونەرمەندانە. بەڵێ بەرابەری و ئامۆژگاری ئەو بوو کە لە "١٩٥١ — ١٩٥٣"وە، ئیبراهیم باڵدار. هەروەها بەکر دلێر (= سەرپەرشتی گۆڤاری: پەیام، خاوەندی زنجیرەی خوێندەواری کوردی) بەڵکو چاپخانەکانی وەك؛ مەعاریف، نەجاح، بیریان کردەوە، کاریان سەرپێ گرت بۆ داهێنانی هەندێك نیشانەی جودا بۆ پیتی عەرەبی — کوردی، کە ئەمانە تۆمارن و هەموویان ناوی چاکەی ئەویان بردووە بۆ خزمەتی ئەو ڕێنووسەی کە لەوە دواتر — ١٩٥٦ — زمانی کوردی

لەڕاستەوە: سەعید فەوزی ٢ـ میرزا مارف(شاعیر)* ٣ ـ ڕەمزی مەلا مارف (شاعیر)**
٤ـ ڕەشید صدقی غەفور ٥ ـ تۆفیق وەهبی(١٨٩٢ـ١٩٨٤) (مێژوونووس و زمانەوانی کورد)
٦ـ غالب ئاغای چەلەبی ٧ ـ محەمەد بریڤکانی (نووسەرو ڕۆژنامەنووس)
٨ـ لەبەرئەوەی لەوێنەکەدا سێبەر کەوتۆتە سەر روکاری بەجوانی دەرنەکەوتووە.
ساڵ: سەرەتای ساڵانی پەنجاکانی سەدەی بیستەم .
شوێن: سلێمانی ـ گەڕەکی سابونکەران .
بۆنە: سەردانی ئەو بەڕێزانە بۆ ماڵی(ڕەمزی مەلا مارف) .

گەیاندە کەلووی ڕووناکی.
هەڵوێستەیەك دەکەین، دەڵێین؛ ڕێنووس، دەستوور، بژاری زمان، بەڵکو زمان خۆیشی هەموو بۆ خزمەتی مرۆڤە تا لەگەڵ ڕۆژگاری ژیان ڕێك بکەوێت.
سەدەی بیستەمیش کە پڕیەتی لە ڕووداوی زانیاری و هونەری، پەیوەندی بە کورد و زمانی کوردیشەوە هەیە. بایەخ دانیش بەم باسە، لە پێش هەر کەسێکەوە ئەرکی زمانەوانی وریایە. هەڵبەتە تۆفیق وەهبی زانا، کە چاوی لە دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردیی و دوا نەکەوتنی جەماوەر بوو لە بزووتنەوەی ژیان، دەبێت تاو بە کۆششی بدا. ڕاستییەکەی، لە ڕیزی پێشەوەدایە کە خۆیشی ئەم باسە ئاشکرا دەکات و دەڵێت: "لە گۆڤاری گەلاوێژدا — وابزانم — فەرهەنگۆکێکی عەرەبی و کوردییم بەناوی — فەرهەنگی گەلاوێژ — ەوە بلاوکردەوە، کە تەواو نەکرا. لەساڵی ١٩٤٢شدا فەرهەنگێکی کوردی — عەرەبی نزیك دوو هەزار وشەی کوردی پەتی و هەڵبژاردە و داڕێژراوی خۆم بلاوکردەوە. ئەو فەرهەنگەش کەڵکی نووسەرانی کوردی گرت چ جای وەرگێڕەکانی عەرەبی بۆ کوردی."، ئەمە لە هەڵێکدا لە گەلاوێژی ١٩٤٣ شەوە، بە تکاوە بانگی دەکرد: "تکا ئەکەم لە خوێنەرەوەکان، بەرامبەر ئەو وشە عەرەبییانەی کوردییەکانی ئەنووسین، ئەگەر وشەی تری کوردی ئەناسن، بۆمان بنێرن تاکو بلاوی بکەینەوە، بۆ ئەمە پیرەکانمان گەنجینەوانی هێژان لێیان کەڵك سین بین.".
کەوا بوو، ڕێنووس، دەستوور، فەرهەنگ، زنجیرەیەك ئامانج بێت، ئامانخی هەرە گەورە چییە و بەرەو کوێ؟

**- ٢ -**

هیوا، تۆفیق وەهبی کردبوو بە مەلەوانێکی بە توانا و لێهاتووی نێو دەریای زانستی زمان. لەلایەك تەواو شارەزای زمانی کوردی و شێوە و بێچووە شێوەکانی بوو. لە لایەکیش تەواو شارەزای زمانی عارەبی و زمانی فارسی نوێ و تورکی و دەستووریان و شارەزای زمانەکانی؛ ئینگلیزی و فەرەنسی و دەستووریان و دەستووری زمانی ئەڵمانیش بوو، هەروەها خەریکی لێکۆڵینەوەی دەستوورەکانی زمانەکانی هیندو ئێرانی و سانسکریتی و ئاڤێستی و فارسی کۆن و فارسی نێونجی — فەهلەوی — و ئەفغانی و بلوژی و هەندێك شێوە زمانی تر بوو، کە لە ١٩٥٦ دا خۆی ئەمانەی گێڕاوەتەوە. ئایا ناتوانین بڵێین؛ ئەمەیەك — کوردێك — ئاسۆی ڕۆشنبیری وا ڕوون بێت. کە یەکێکیش ئەوها چڵەی چاوبدات و بتوێتەوە، دەبێت ئامانجێکی مەزنی وەك ئامانجی "ئەمین زەکی" کوڕی شەرەفنامە بێت

و كەمتر نەبێت.
خۆی لە گەلاوێژی ١٩٤٣ دا، بەناوی "زنجیرە وتار لە بابەت بنج و بناوانی زمانی کوردییەوە" دەمانباتە بەردەم ئەو ئامانجە مەزنە، کە بەم جۆرەش دەمانبات.. دەڵێت: "ئەو خوێندەوارانەی بڵاوکردنەوەکانی ئەم دواییەی زمانی کوردی شوێن کەوتوون، ئەبینن کە ئەو وشە بێگانانەی لە سەردەمی دوور و نزیکەوە جێگیر بوون لە زمانەکەماندا، بەرە بەرە جێی خۆیان بەرەڵڵا ئەکەن بۆ وشەی کوردی، وەبەرامبەر بەو وشە تازانەش کەوا بە پێویستی زانست و هونەر و پیشەی باوەوە تازە دائەهێنرێن لە گێتیدا، وشەی کوردی پەتی، خراوەتە کار، پڕ بە مانای خۆی. گەنجینەی زمانی کوردی لە هەموو فەرهەنگێکی زمانەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیك، پڕترە لە گەوهەر. من بیست ساڵێك ئەبێ کە بەچاوێکی پشکنین و دەستێکی چنینەوە بەناو ئەم گەنجینەیەدا ئەسووڕێمەوە، لەپاش ئەوە کە گەلێ لە گەوهەرەکانیم جوێ کردەوە و گەردم سڕین و لێکمدانەوە و پەیم بە بنج و بنەوانیان برد، تێگەیشتم کە ئەم گەنجینەیە: کە دەمی خۆی زمانی دینێك بووە و شارستانیەتی هەرە بەرزی داداوە، ئەو زمانەیە کە ئاوێستای پێ نووسراوەتەوە.. گەوهەرەکانی ئەم گەنجینەیە کە ئاوێستا چوار هەزارێکیانی بۆ شاردووینەتەوە لە - ئێسکە کۆنەکانیدا — ئەمڕۆ لە ئێسکێکی باویاندا لە ژێر دەسمانان، بەڵام داخم ناچێ، گەلێکمان وەك دراوێکی لەڕەوا کەوتوو لە کون و قوژبندا فڕێ داوە و دەسمان درێژ کردووەتە داریژراوی بێگانە.
ئامانجم لە بڵاوکردنەوەی وتارەکانی — بنج و بناوانی زمانی کوردی — لە گەلاوێژی خۆشەویستدا ئەوە بوو کە بچینە ناو ئەم گەنجینەیەوە، وە پێکەوە، بەشێنەیی تێیدا بسووڕێینەوە، کەچی لەپاش بڵاوکردنەوەی وتاری نۆیەم، وەها ڕێکەوت کە خەریکی هەندێ کاروباری تر بم وە بەدەمی — موقتا — دەس لەوان هەڵگرم. بەڵام هەمیشە بەداخەوە دێم و ئەبینم کە کوردەکان زمانەکەی خۆیان ئەبەنەوە سەر زمانی پەهلەوی وە بە پەهلەوییەوە ئەنازن. لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی، لە بەرەوە هەندێ زانیاری لەبارەی تیرەی زمانەکانەوە بڵاوبکرێتەوە. لە وتاری چوارەممانا لە باسی دروستبوونی شێوەکانی کوردی و باسی وشەی "کرمانج" دا زانیارییەکی زۆر کورتی بەکەڵکم بڵاوکردبووەوە لەبارەی تیرەی زمانی کوردییەوە.

پێشانم دابوو کە زمانی کوردی لە: تیرەی زمانی کۆن — پەهلەوی — فارسی تازە نییە!!".
ئەم ئامانجە مەزنە، کە خۆیشمان ئاگاداری نەبووین، زووتر لەلای بێگانە، دیار بووە. بەڵگەش ئەم باسەیە کە گەلاوێژی تەموزی ١٩٤٠ باسی دەکات و دەڵێت: "گۆڤاری: جورنال ئۆف ڕۆیال سانترال ئێژیان سۆسایتی — بە قەڵەمی؛ سی. جەی. ئەدمۆندس C.J.EDMONDS گەلاوێژی تەنقید کردووە [ = هەڵسەنگاندووە و لەمەڕ تۆفیق وەهبی — یش گوتوویەتی]: تۆفیق وەهبی بەگ کە عالمێکە، ناوبانگی بڵاوبۆتەوە بۆ ئەوروپا لە زنجیرە وتارێکی عالیمانەی کە لە بابەت فیلۆلۆژی — علم اشتقاقی زمان — ئێرانییەوە، سیانیانی تێدا بڵاوکردووەتەوە. (= واتا لەسەرەیای گەلاوێژدا ١٩٣٩ — ١٩٤٠/ ك. ر. م). لەمەدا ئامانجی تایبەتی دۆزینەوەی بنج و بناوانی زمانی کوردییە!".
لێرەدا دەبێت سەرمان لێ تێك نەچێت و بزانین کە لەو ڕێگا سەختەدا — زمان — بەشێکی زانستی ئەنثروپۆلۆژیای ڕۆشنبیری بووە، کە تۆفیق وەهبی لەگەڵ پشت بەستن بە ئەنثروپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی، کەڵکی لێ وەرگرتوون. بە واتایەکی تر، کەڵکی لە زمان، لە کۆڵینەوە لە بەردە نووسراوێك، چیایەکی هەڵکۆڵراو، نەریت و خوو، ئەفسانە، داستانی دێرین، گۆرانی کۆن وەرگرتووە. دیاریشە کە پەیڕەو کردنی ئەو زانستانە، دەور کردنەوەی ڕووخسارە زۆرەکانی — ماددی و مەعنەویی — سەدەکانی پێش عیساو پاش ئیسلام و هەتا ئەمڕۆی ویستووە، هەروەك دەورکردنەوەی سەدەها بیروڕای زاناکانی: مێژوو، جوگرافیا، زمان، ئەرکیۆلۆژیاو یادگاری ڕۆژهەڵاتناس و گەشت وانە بێگانەکان و کورد ناسەکانی ویستووە.. ئا بەم توانایانەوە بە زانست — نەك بە زۆر — ئەو، وەڵامی ئەو پرسیارە گەورەیەی — زیاتر — دایەوە کە: کورد کێیە؟!.
ئەو، بە دەستوور و خوێندەواری باوەکەیەوە، بە گۆڤاری گەلاوێژ، دەنگی گێتی تازە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق و کورد و چەندی تر ، ئەو درۆ و لافە ناڕاستانەی — لەوانەشدا؛ لافەکانی مەکەنزی — دایە دوواوە و بۆ بەرەودوا ساغی کردەوە کە: زمانی کوردی ئێستا — سەر بە فارسی تازە - پەهلەوی — نییە، بەڵکو شێوەیەکی مادی نێونجییە و کوردیش = کرمانج، وەچەی ڕاستی مادەکانە.

لێکۆڵینەوە ئەنترۆپۆلۆژییەکانی بە ئینگلیزی چ جای بە عارەبی (ئەشکەوتی گوندۆك — ١٩٥١ بە ئینگلیزی، کە لە وێنە هەڵکۆڵراوەکانی ئەشکەوتی گوندێکی نزیك ئاکرێ دەکۆڵێتەوە) و (ئەسڵی ناوبردنی شارەزوور — ١٩٦١ بە عەرەبی — کە هەتا شەرەفخانی بەتلیسی دەدوێنێت) و (ئاڵتون کۆپرۆ — پردی ئاڵتون — ١٩٥٦ بە عارەبی — کە بە"زێ" دا هەڵدەکێشێتەوە بۆلای ئاوێستا) و (قەڵایەکی کیانیی لە ژووری سلێمانیدا — ١٩٥٨ بە عارەبی — کە قزقاپان و جوڵندی تەمەندار دەکات) و (سەفەرێك لە دەربەندی بازیانەوە بۆ ملەی تاسڵوجە - ١٩٥٨ بە عارەبی — کە دێرین دەکات) هەروەها وەرگێرانی (قسنێك لە کوردستانا — ١٩٤٦ لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردیی) بۆ ئەو ئامانجەی خستبوونە کار و ئەوانە و لێکۆڵینەوە زانستییەکانی تری (القصد والاستطراد فی اصول معنی بغداد — ١٩٥٠) و (بهرام گور — ابعاد معنی الیحمور اسم الملك — ١٩٥٧) هەموویان ڕاستی پەیوەندییەکەیشی بە زانستی ئەنترۆپۆلۆژیاوە ساغ دەکەنەوە کە زانایەتی.
بۆ ڕاستی ئەم باوەڕەش، بە کورتی، قسەی شایەتێك دەخەینە بەرچاو کە لە ئینگلیزییەکە و کوردییە کەی "ئەشکەوتی گوندۆك"دا تۆمارە، زانا: ستون لیوید دەڵێت: "خاوەن بەرزیی کە دەمێکە خەریکی لێکۆڵینەوەیە لە ئەنترۆپۆلۆژی کۆمەڵایەتی و ئاثاری کۆنی لیواکانی شیمالی عێراق، ئیقتراح ئەکا بۆ ئەوە گۆڕینی ڕمووز و نیشانەکانیان تەقدیر بکرێ. مەقسەدی هەڵکەندراوەکانی لەگەڵ خەرافاتی کۆن تێکەڵ کردووە.. وە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و لێدوانی بە پێشاندان و وەسفکردنی چەند نموونەیەك لە طقووسی دینی دوایی هێناوە کە دڵگیرن، چونکە تا ئێستا ئەبحاثی ئەنترۆپۆلۆژی لەناو کوردەکانا بە ئەندازەیەکی زۆر نەبووە.. هتد).

**- ٣ -**

تۆفیق وەهبی، ئەفەرمووێت: "لە ساڵی ١٩٤٣ دا گۆڤاری دەنگی گێتی تازە - دامەزرا کە بە چاودێری زمانەوانی من، دەردەچوو. نەمدەهێشت هیچ گوتارێکی نووسراوی دەستەی نووسەرانی بڵاوببێتەوە هەتاکو لە چاکی زمانەکەی دڵنیا نەبوومایە. هەندێك جاریش کە پێویست دەبوو، خۆم چاکم دەکردن.". ئەم فەرمایشتەیش ڕاستە، لەلایەك ئەگەر نووسراوەکانی گۆڤارەکە دەوور بکرێتەوە. لە لایەکی ترەوە کە شایەتێکی زیندووی وەك: حەسەن شێخ حەمە مارف کە نووسەری ئەو گۆڤارە - وەك بۆی گێڕاومەتەوە - وابڵێت. تەنانەت دەتوانین بڵێین — هەتا چاودێری زمانەوانی دەکرد — کە ئەو چاودێرییە، پیشەی هونەری دروستکردنی "هەواڵی ڕۆژنامەنووسی" لە ڕۆژنامەنووسی کوردییدا، لە ڕووی ڕەوانیی و کورت بڕی و زمانەوە، پتەو کرد. لەوە زیاتر — وەك لە هونەری ڕۆژنامەنووسیی و ڕادیۆدا. دەکۆڵمەوە - لام ڕوونە کە ئەو چاودێرییە، گەیشتووەتە یەکەم ڕادیۆش، کە ڕادیۆی کوردی بەغدایە. لە سەرو ئەم ڕاستییەوە ڕاستییەکی ونیش ئەوەیە، کە بۆ دامەزراندنی رادیۆی کوردی بەغداد کە لە ١٩٣٩ دا حکومەتی عێراق بڕیاری دامەزراندنی دا، لەنێو کوردا - ٢ — کاریان بۆ پێگەیشتنی ئەو بڕیارە کردووە، کامل کاکەمین —ی یەکەم کارگێڕی ئەو ڕادیۆیە، لای من قسەی تۆمارە و دەڵێت "وەك ئێـمە دەزانین خوالێخۆشبوو ئەمین زەکی بەگ و تۆفیق وەهبی بەگ پێشڕەوی ئەم دامەزراندنە بوون١"، زیاتر دەڵێت: "تەرجەمە کردنی دەنگ و باس کە لەئینگلیزییەوە دەکرا بە کوردی، لەژێر چاودێری تۆفیق وەهبی بەگ دا بوو." گومانیشی تێدا نییە کە چەسپاندنی زمانێکی کوردی ڕەوان بۆ ڕادیۆ — کە دەزگایەکی ناسکە بۆ هەموو گوێگرە کوردەکان — لەلای ئەو ئەرکی سەرشان بووە.
دەشتوانین بڵێین، کە ئامۆژگارییەکانی کاری بۆ پێگەیاندنی چەند ڕۆژنامەنووس هەبووە، کە یەکێکیان ڕۆژنامەنووسی ون و بە توانا، وەرگێڕی دەنگ و باسی ڕادیۆ، حەسەن شێخ حەمە مارفە. هەروەها کاری لە عادل جەمال عیرفان و بەکر دلێر و ڕەفیق چالاکیش کردووە، کە لە گۆڤاری — پەیام و ڕادیۆدا — لە پەنجاکاندا کاریان دەکرد. جگە لەمانە، دەیەها مامۆستا و ڕۆشنبیر و قوتابی و دۆستانی ڕۆشنبیری کوردی پرس و ڕایان پێ دەکرد و لە ساڵی ١٩٥٦ دا، یانەی سەرکەوتن - ی کوردان لە بەغدادا، کردیان بە سەرەکی شەرەف و ئەویش لە کۆڕەکانیدا چەندین گوتاری زمانەوانی و لێکۆڵینەوەی زانستی بە نرخی پێشکەش دەکرد.
دوو لایەنی تریش شایانی سەرنجە، کە یەکەمیان ڕاستی خزمەت گوزارییەکی بەرامبەر بە "عێراق" و

زانست و ئەدەبی عەرەبی خۆی جگە لەوەی کە لە ساڵی ١٩٢١ — ١٩٣٠ ئەفسەرێکی لەشکری عێراق بوو، لە ساڵی ١٩٥٨ دا سەرۆکی کۆمەڵەی دانان و وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی — عێراق بوو، کە گۆڤاری بەنرخی "الکتاب" ی مانگانەی دەردەکرد. بێجگە لە گوتارە زانستییەکانی کە بە عەرەبی بوون — باسیان کرا — گەورەترین خزمەتی ئەوە بوو کە؛ هەردوو جزمی "دەستووری زمانی کوردی" ی خۆی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی و وەك خۆی گوتوویەتی "بۆ خزمەتی برا عەرەبەکان". ئەمە جگە لە شێوازی نووسینی ڕەوان و زانستییانەی بە عەرەبی و ئاشناکردنی خوێندەواری عەرەب بە گەلێك زاستی مێژوویی چ جای زمانەوانی. وەك ئەم ڕاستییەش نامرێت، ئەو ڕاستیەش هەروەها کە خزمەتی ڕۆشنبیری ئینگلیزی و جیهانی کرد کە بە زمانی ئینگلیزی گەلێك باسی لەمەڕ ڕۆشنبیری کۆنی ئەم ناوچەیە و کورد و زمانی کوردی و شوێنە دێرینەکانی کوردستانی عێراق بڵاوکردەوە. گەورەترین خزمەتیشی بۆ زمانی ئینگلیزی (فەرهەنگی: کوردی — ئینگلیزی) یە کە بە هاریکاری مستر ئەدمۆندس دانراوە.

بێگومان هەر زانایەك، هەمیشە، دەوری کارەکانی بکاتەوە، بڕیار دەدات کە ئەوانە بەگشتی، خزمەتی گەورە بوون بۆ زانست و مرۆڤایەتی و بە هەقیانەیتش، شەرەفی "زانایی" پێ بڕاوە، کە لە پاش خۆیشی — چەندین — کاری بەنرخ و بڵاونەکراوەی، زیاتر مێژوو دڵنیا دەکەن کە کوڕی "پیرەمەگروون" نەمرە.. بەڵێ تۆفیق وەهبی!.

- ٤ -

### پەراوێزێکی مێژوویی..

لەسەر ڕاپەڕینە نەتەوەییەکەی جەماوەری سلێمانی (ناسراو بە: شەڕی بەردەرکی سەرا: ٦ ی ئەیلوول -ی ١٩٣٠) دژی ئینگلیزی داگیرکەر و حکومەتی نوری سەعید، کتێبی ئەحمەد خواجەی مێژوونووسی دۆست (چیم دی — بەرگی ، ٣) بە گێڕانەوەیەکی ئاڵۆز، لە لایەکدا دەڵێت کە حکومەت (بەم بزووتنەوەیە ئاگادار کرا. تۆفیق وەهبی بەگ برایەوە بۆ بەغدا — ل ٨٤). لە لایەکی تردا، دەڵێت: (زۆرترینی کوردەکانمان بە گلەیین و ئەڵێن ئەم کوشتار و پەرێشانییەی لە شارەکەی خۆیدا — سلێمانی، ڕوویدا، ئەو تاوانبارە - ل ٩٨) کە ئەمانەی بە پەراوێز داناوە بۆ ئەو "بەیاننامە گرنگەی تۆفیق وەهبی بەگ: ڕۆژنامەی: الراصد — بیروت. ع٣٧٦٦. ٢٤ ئاب ١٩٣٢". دیارە مەبەستی مێژوو نووس ئەوەیە کە ئەو — تۆفیق وەهبی بەگ — لە سلێمانیدا بووە و بە بەرچاوی ئەوەوە، ئەو کارەساتە لە شارەکەی قەوماوە، کە موخابن هەندێك نەشارەزاش وا دەڵێن!.

ئەو بەیاننامەیە (کە چیم دی — بڵاوی کردووەتەوە) شایانی سەرنجە کە (خۆپیشاندانی ئاشتی خوازانەی سلێمانی: پەراوێزی — د) بەڕەوا دەزانێت و زیاتر دەڵێت: (وەزارەتی عێراقی ڕەفتاری توندو تیژی ناجوامێرانەی بەکار بردبوو بەهۆی شۆڕشی شێخ مەحموود کە بە نێروویی ئینگلیز و سیاسەتەکەی، دامردەوە!".

لێرەدا ئەم دوو پرسیارە سەر هەڵدەدەن:

١- ئایا — وەهبی بەگ — ئەو کاتە موتەصەریفی سلێمانی بووە؟

٢- تاوانبارێك، لە بەیرووتەوە پاش ٢ ساڵ ڕوودای، ئەو بەیاننامەیە بۆچی دەردەکات کە بە تەواوی بەیاننامەکە لەسەر کورد دەکاتەوە؟

وەڵامی بە کورتی، بەم جۆرەیە:

١- ئەنجوومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی ٢٨ نیسان ١٩٣٠ دا بڕیاری دا "تۆفیق وهبی بگ — آمر المدرسة العسكرية الملكية و دار التدريب" بە موتەصەریفی سلێمانی دابنرێت. (نامەی ژمارە: ٦٢٤١ ی ٦ مایس ١٩٣٠ ی وەزارەتی ناوخۆ وای نیشان داوە کە ئەمەش پاش — ئیرادەی مەلەکی: ژ ١٠٥ ی ٣٠ نیسان ١٩٣٠)ە.

٢- لە ١٠/مایس/١٩٣٠ دا لە سلێمانیدا چووەتە سەر فرمانەکەی هەتا (٢٢/ئاب/١٩٣٠). (دۆسیێی کەسی خۆی — پارێزگای سلێمانی).

پاشکۆ:

(٢ بەڵگەنامەی ڕەسمی لە دۆسیێی تۆفیق وەهبییەوە وەك خۆی)

١- "بروسکەیەك وەك چۆن نووسراوە"

لەوەزارەتی داخلییەوە

بۆ مفتش اداری سلێمانی

ژمارە: ١١٣١٦

ڕوز: ١٩٣٠/٨/٢١
اعلامتان اکەین استغنا کرا لە خدماتی متصرف توفیق وهبی بگ.

دائرەی متصرف لواء سلیمانی
ژمارە: ١٨٢٥/٨٢
ڕوز: ١٩٣٠/٨/٢٤

بو رؤسای دوائر
اوا صورتی مترجمەی تلغرافی وزارەتی داخلیە دائر بە استغنا کردن لە خدماتی توفیق وهبی بك بو معلومات نیررا.
"ئیمزاییکە بە ئینگلیزی"
وکیلی متصرف سلیمانی

٢- (نامەیکی ڕەسمییە بە ئینگلیزی و عارەبی. وەك خۆی بڵاوی دەکەینەوە).
وزارة داخلية العراق
العدد ١١٤٥١
التاريخ ٢٦/٢٥/آب/١٩٣٠
"شعبة الامور الذاتية"
بناء على الاستغناء عن توفيق وهبى بك متصرف لواء السليمانية قطعت علاقته من اللواء اعتبارا من ٢٢/آب/١٩٣٠ قبل الظهر.
"ئیمزا"
عن وزير الداخلية

(٢٢)ی ئاب هەتا "٦" ئەیلوول "١٥" ڕۆژی نێوانە) کەوا بوو: ئەو لێرە نەبووە. تاوانبار نییە!!
بەڵگەی گەورەتریش ئەم تۆمارەیە.. ڕۆژنامەی (ژیان: س ٥. ژ ٢٥٩. ١١ ربيع الاخر ١٣٤٩ = پێنج شەمە ٤ ئەیلوول ١٩٣٠؛ واتە ١٤ ڕۆژ دوای لاچوونی موتەصەریف توفیق وەهبی و ٢ ڕۆژ پێش ٦ی ئەیلوول):
١- سەرگوتاری ڕۆژنامەکە "موفارەقەتی سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ بە تەواوی تەئثیری کردۆتە میللەتەکەمانەوە":
ڕۆیشتنی موتەصەریفی غەیوورمان، سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ، بۆ بەغداد و [خەبەری ئینفیصالی] لە موتەصەریفی ییەتی ئێرە، جیددەن زۆر تەئسیری کردە ئەهالیکەمان. بە عوموومی کوردەکانی عێراق و بە تایبەتی ئەهالی ئەم لیوایە بە گەورە و بچووك و ژن و پیاوەوە موتەئەثیرە و بۆ ئیعادە کردنەوەی حورمەت کەشن و بۆ هاتنەوەی لە هەموو لایکەوە ئیستیرحام نامەیان تەقدیمی حکوومەت کردووە.

٢- وەختێ کە (هەمان ژمارە دەڵێت) سەعادەتی موتەصەریف تۆفیق وەهبی بەگ مواصەڵەتی بەغدادی کردو غەزەتەکان نووسییان [ئینفیصالی پێ کراوە] لە هەموو لایەکەوە ئەهالی ، ڕوئەسای عەشائیر، بۆ ئیستیرحام ئیعادە کردنەوەی موشارو ئلیە ئەم تەلغرافانەیان نووسی و تەقدیم کرد و قسمێکی تەلەغرافەکان بەڕیزە نەشر ئەکەین (تەلەغرافەکان بۆ فەخامەتی مەندووبی سامی و فەخامەتی رەئیس ئەلوزراء لە لایەن ئەشرافانی سلێمانی و سەرۆکەکانی عەشایرەکانی پشدەر، هەورامان، لە ٢٠، ٢٤، ٢٦، ١٩٣٠/٨/ دا لێ دراون. ك. ر. م) دەڵێن... (.. جلب المتصرف الى بغداد استوجب التوحش والهيجان) یان (.. گۆڕینی موتەصەریف وەهبی بەگ ئەبێ بە سەبەبی تەئثوری عوموومی کوردان. رجا ئەکەین — زوو — ئیعادەی بفەرموون).
کەوابوو، لە ٨/٢٢ هەتا ٩/٤ ئەیلوول- ی پێش ٦ی ئەیلوول، دوای هاتنەوەی (تێ گەیشتووترین و چاکترین میللەتەکەمان و لەسەر ئەفرازانی عیلم و مەعریفەت کە ئەم وەطەنە پێی گەیاندووە و کە هەموو میللەت بە دڵێکی ڕوون و بێ غەشەوە خۆشی ئەوێ و کە یەکانە هەر ئومێدی بە عیلم و عیرفان بووە، سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ -: ژیان. ژ ٢٣٩. ١٩ مایس ١٩٣٠. بەبۆنەی هاتنی.) ی کردووە.
هەرگیز هیچ ئاقڵێکیش باوەڕ ناکات کە هەتا (٤)ی ئەیلوول لێرە نەبێت، (٦)ی ئەیلوول لێرە بێت.
ڕاستییەکەی ئەوە پەسەندە، بگەڕێین لەوە بپرسین: "بۆچی ئینفیصالی پێ کراو لە ٨/٢٢وە لێرە نەما؟
هەرچەندە ڕووداو زۆرە و هەندێکیان تۆمارە و هەندێکیان نادیارە، ئێمە دوای ٢ ڕووداوی گرنگ دەکەوین کە: زۆر مایەی لابردن و دوور خستنەوەی ئەون:
١- لە ١٦ی تەمووزی ١٩٣٠ دا [وەلی عەهد] تەشریفی هات بۆ سلێمانی و لە سەعات: (٩)دا (= نۆی عەرەبیی جاران — عەسر) خۆنیشاندانێکی؛ سەربەست، ڕێك و

پێك ئاسوودە ڕێك خرا بۆ وەرگرتنی مافی میللەت. (ژیان: س ٥. ژ ٢٥٢. ٢١ تومووز ١٩٣٠ ئەو باسە تەواو روون کردووەتەوە و ئەم باسەیش درێژەی هەیە هەتا ١٠ی ئابی ١٩٣٠.)

٢- ڕۆژانی: ٨، ٩، ٨/١٠ "ئاب" ١٩٣٠، وەکیلی مەندووبی سامی و وەکیلی سەرەك وەزیرانی عێراق، بە کەرکوك و هەولێر و سلێمانیدا گەڕان. لە ٨/١٠ دا — پێش لابردنی موتەصەریف بە "١٢" ڕۆژ. — کە گەیشتنە سلێمانی، خۆنیشاندانێکی سەربەست و ئاسوودە و ئاشتی خوازانەی جەماوەری گەورەی سلێمانی کە دژی ئینگلیز و سیاسەتە گلاوەکەی بوو پێشوازی کردن. جەماوەر، نوێنەرانیان ڕاسپارد — بە ئاشکرا — داوای مافی خۆیان بکەن. (بنوارە: ژیان — ژ ٢٥٧ پێنجشەممە ١٤ ئاغستوس "ئاب" ١٩٣٠ کە بە درێژیی هەموو شتێك باس دەکات) سەرئەنجام نوێنەرانی جەماوەر و بەرامبەرەکانیان، تەواو لە یەکتر دوور و بڕوا جیاواز بوون، بەڵکو هەڕەشەیان لە یەکتر دەکرد، کە دیارە، بارەکە ترسناکە.

دوور نارۆین و — لێرەدا — ئەم پرسیارە تەماشا دەکەین: ٤ مانگە، لە (١٠) ی مایسەوە، بە (١٦)ی تەمووزدا، هەتا (١٠)ی ئاب، تۆفیق وەهبی (دنیادیدەو ئەفسەرێکی ناسراو) موتەصەڕیفی سلێمانییە و ئەم ڕووداوانەش زیاد دەبێت، ئا ئەم باسە چەندی بە چەند؟ یان ئەوەتا بێ دەسەڵاتە و فەرمانی میری پێ ڕایی ناکرێت کە ئەم لافە بە توانای ئەو ناوێرێت، یان ئەوەتا خۆی ئاگری بن کایە، هەر هیچ نەبێت پێی خۆشە و ڕێگای خۆش دەکات کە ئەمەش — بە خەیاڵی ئەوان — نابێت ڕوویدات بە تایبەتی کە پرۆژەیەکی گەورەیان بە ڕێگاوەیە. کەوابوو دەبێت ئەو موتەصەڕیفە - کورتترین تەمەنی موتەصەڕیفی - یەتی بەشی بێت، بەڵکو لەوە زیاتر کار کەنار بکرێت، بەڵکو هەر نابێت لە وڵاتدا بمێنێتەوە کە هەر وایش ڕووی داو تۆفیق وەهبی، لە بەیروتدا نیشتەجێ بوو کە لە ١٩٣٢ شدا، لەوێوە بەیاننامەی دەرکرد و لەوەش دەچێت هەتا ١٩٣٥ لە گێژاوی ناهەق و نارەوادا ژیابێت، وەك لەو ساڵەدا پیرەمێردی شاعیر و ڕۆژنامەنووس — لەلاوە - هەواڵێکی ئەوی بڵاو کردووەتەوە و دەڵێت: (تۆفیق وەهبی بەگی موتەصەڕیفی پێشووی خۆمان، بیستمان بۆ خدمەتێکی باش نێرراوە. مەملەکەتەکەمان سەراپا پێی خۆشە و سپاسی دیوانی و ڕەهبەری ئەو کەسە دەکا کە بە حیسسێکی ویجدانی و ئینسانی ئەم کوڕە قیمەتدارەی وڵاتەکەمانی لە: گێژاوی ناهەق و نارەوا دەرهانی. / ژیان: س ١٠. ژ ٤٤٧ شەمو ٧ی تەمووز ١٩٣٥).

# له بابەت بنج و بناوانی زمانی کوردییەوە

تۆفیق وەهبی

**سەرەتا**

ئەم زنجیرە وتارەم، خاصە بۆ زمانەکانی ئێرانی. بەڵام چونکە دەستەی زمانەکانی ئێرانی سەر بە پەلی بۆ زمانەکانی هیندۆ- ئێرانییە، کە لە زمانی ئاری (هیندۆ-ئەوروپایی) بووەتەوە و بۆ ئەوە کە ئەو زانیارییەی لەو بابەتەوە ئەینووسین، نەبێتە مەعلووماتێکی ئوریژناڵ، بەپێویستم دی کە لەپێشەوە بە صوورەتێکی گشتی و کورت بە شەرگــــێ کە بەس بێ بۆ مەقصەد، لە موهاجرەتی ئارییەکان و خێزانی زمانی ئاری و لە زمانەکانی پەلی هیندۆ- ئێرانییان باس بکەم و بە مناسبم زانی کە مانای وشەی ئاری و ئێران و تەعریفێکی جوغرافیی بانی ئێرانی بکەم بە سەرەتای وتار.

**(١) مانای ئاری و ئێران:**

ناوی ئاری کە دراوە بە نەتەوەییێکی زانراو لە صیفەتێکی ئەریە (arya) هاتووە، کە بە ئاوێستایی لە شکڵی ئەیریە (airya) دایە، کە لای زۆرترینی زاناکان وایە کە ماناکەی سەر ڕاست و نەجیب و عالی جەناب بێ، ناوەکە لە فارسیی کۆندا (زمانە بەردەنووسەکانی هەخەمەنشی) لە شکڵی ئەریە (Arya) و لە فارسیی ناوەراست (زمانی پەهلەوی) و لە فارسیی تازە (فارسیی دەوری ئیسلامی)دا لە ئێسکی ئار (er) دایە. بە سانسکریتی ئەریە (Ăriyah) بەو قەومە ئەڵێن کە زمانەکەیان ویدەیی (Veda) یە.
هەرچی وەکوو ناوی ئێران بێ کە دراوە بە وڵاتێکی زانراو لە صیفەتێکی ئەریەنە (aryana)ەوە هاتووە، کە لە ئاوێستادا لە ئێسکی ئەیریانە (airyana) و لە پەهلەوی و فارسیی تازەدا لە شکڵی ئێران (Eran)دا ئەیبینین و ماناکەی عائیدو خاص بە ئاریەکان و وڵاتی ئاریەکانە. تەلەفوڤی ئێران (Iran) کە ئێستا زمانزەدە شکڵێکی تازەی چەند صەد ساڵەی ئێران (Eran)ـە، ئێستاش گەلێ لە ئێرانیەکانی وەکوو خەڵکی هەندێ موقاگـــهعەی فارس و ئەفغانستان و بلووجستان و کوردەکان... هتد، ئێران (Eran)ی پێ ئەڵێن.

**(٢) بانی ئێران:**

بانی ئێران، کە لە ڕۆژاوای ئاسیای ناوەڕاستدایە، وڵاتێکی پانە و چوار دەوری بە کێوی بڵند گیراوە: لە گرێی ئاراراتەوە زنجیرە شاخێك بە ناوی زاگرۆس بەرەو جنووب و جنووبی ڕۆژهەڵات دێتە خوارەوە کە سنووری ڕۆژاوای بانەکە تەشکیل ئەکا. هەر پەلەکانی ئەم زنجیرە شاخانەیە کە لەپێش ئەوە، کە بە قەراغی ڕۆژاوای خەلیجی فارسداو دەمێکیش بە کەناری زەریای موحیگی هیندیدا ئەڕوا ئەبنە سنووری نیوەڕۆ (جنووب)، دیسانەوە لە گرێی ئاراراتەوە بەناوی کێوەکانی ئەلبورز، پەلی بۆ ڕۆژهەڵات درێژ ئەبێتەوە کە لە جنووبی زەریای قەزوێنەوە تێپەڕ ئەکا و ئەڕوا هەتاکوو لەگەڵ پەلی هیندکۆش یەکدگیر ئەبێ کە لە پامیرەوە، کە بەسەربانی دنیا بەناوبانگە، بەرەو ڕۆژاوا، بووەتەوە، ئەم پەلە لە دیواری باکوور (شیمال)ـە، قولەی هەرە بەرزی ئەلبورز شاخی دەماوەندە کە گەلێ وەقایعی ئەساگیری و قەهرەمانیی ئێرانی قەدیمی تێدا قەوماوە، چوحاکی ماری لەو ڕۆژەوە کە فەریدوون گرتوویەتی، هەتا ئەمڕۆ لەوێدا بەندییە ئەو شاخانەی لەلای ڕۆژهەڵاتەوە بانەکەیان دەورە داوە، دیسانەوە لە پامیرەوە بەرەو جنووب پەلیان فڕێ داوە و لەگەڵ پەلەکانی سنووری جنووب کە بەرەو شیمال بە ناو بلووجستان و ئەفغانستاندا ڕاست بوونەتەوە، یەکدگیر بوون.
مەساحەی بانی ئێران دوو ملیۆن و شەشصەد هەزار کیلۆمەتر مورەبەعە. حکوومەتی ئێرانی ئەمڕۆ، نزیکەی دوو سێیەکی بانەکە ئەگرێتەوە، سێیەکەکەی تری ئەفغانستان و بلووجستان و سائیرەیە کە لەبەرەو دوایی صەدەی (قرن) هەژدەمی میلادییەوە بەرەبەرە لێی جوێ بوونەتەوە.
لە ناوەڕاستی بانی ئێراندا دەشت (کەویر)ێکی گەورە هەیە کە خەڵکی نیوەڕۆیی پێی ئەڵێن دەشتی (لووت). لمانی و شوورەزارە. وا دیارە کە ئەم دەشتە وەختی خۆی زەریا بووبێ. ئەو گۆلانەی ئەمڕۆ هەن لە بانی ئێراندا بە پاشماوەی ئەم زەریا گەورەیە زان ئەکرێن. هەرچەندە ڕووبارەکانی بانی ئێران هەزار میلی زەوی ئینجا ئاو بدەن، بەڵام کشتوکاڵی دێمی گەلێ فراوانترە. بانی ئێرانی ئەڵقەی لێکدانە لە میانی ڕۆژهەڵاتی دوور و ئاسیای ڕۆژاوایی و ڕۆژاوادا و لە سەردەمەکانی پێش تاریخە و چاوتێبڕاو و بوارگای جەنگاوەران و کۆچکەران بووە.

## بڵاوەکردنی ئاریەکان بۆ ئەوروپا و ئاسیا*

**(١) کۆچی ئاریەکان:**

وا زان ئەکرێ کە ئەگەر بکرایە و بگەڕاینایەوە بۆ بەروپشتی صەدەی (قرنی) سی و پێنجەمینی پێش میلاد، لەو ساڵانەدا لە نیوەڕۆی (جنووبی) ڕووسیە، لەو دەشتە پانانەدا، کە لە باکووری (شمالی) زەریەی قەزوین و کێوی قاف و زەریەی ڕەش و ڕۆژئاوای ئوراڵەکاندان، بزووتنەوەیەکمان ئەدی کە ئاسایی (اعتیادی) نەبوو بۆ خاوەنە کۆچەریەکانی ئەو توورەیە (بقعەیە). ئەم بزووتنەوەیە بارکردنێکی گشتی (عمومی) بوو کە لەلایەن نەتەوەییێکی (قەومێکی) گەورەوە دەس پێ‌کرابوو کە لە سەردەمی نەزانراوەوە لەم

* گەلاوێژ (گۆڤار)، بەغداد، ژمارە ٢، ساڵی یەکەم، کانوونی دووەمی، ١٩٤٠، ل١٣-١٩.

دەشتانەدا لەباری (وچعی، حالی) کۆچەریدا ئەژیان، ئەوا، عەشیرەتە زەبەندەکانی (متعددەکانی) ئەم نەتەوە گەورەیە بەو خواستە (قصدە) کە جارێکی تر ئەگەڕێنە دواوە، هەر یەکە بە شوێن تووڕەییێکەوە، کە هەمموو پێویستێکی ڕابواردنی تێدا پڕبێ، بەرەو ئەو ئاقارانە (اتجاهاتە) کە سازگاریان (مساعدیان) دیبوو، لە باری هەڵاتندا بڵاوئەبوونەوە.

ئەم نەتەوەیە نەتەوەی ئاری بوو، کە نازانین لە کوێوە هاتبوونە ئێرە؟ هۆی (سببی) بارکردنیشیان لێرەوە بە بری (ڤگعی) لامان زانراو نییە! بەڵام واگومان ئەکرێ کە وشکبوونەوەی لەوەڕ و چایەر لە رووی بێ وچانیی هەندێ وشکەساڵ و سەرماو سۆڵەی بەرگەنەگیراو (غیر قابل تحمل) و لەگەڵ ئەمەشدا، پەرەسەندنی مرۆ (نفوس) و گاگەل، بە چەشنێ کە ئیتر لەوەڕ بەشی نەکردبن، بووبێتە هۆی ئەم بڵاوبوونەوەیە. بە گومانم کە هەندێ قەوماوی (حادپاتی) کۆمەڵایەتی و جەنگیش لەمەدا دەسی بووبێ.

ئاریەکان لەم دەشتە گەورەیەدا، ژیانی عەشائرییان هەبوو. وا دەرئەکەوێ کە نەتەوەکە لە عەشائرێکی زەبەندەی سەربەخۆ دروست بووبێ و ئەم عەشیرەتانە کە لە تووڕەی جوێ جوێدا و بەڵام لە تەنیشت یەکەوە، ڕایان ئەبوارد، بەستراوی یەك ناوچە (مرکز) نەبووبن. وە ئەشێ کە لەناو خۆیانا هەندێ جاریش تووشی ڕقەبەری و دوژمنایەتیش بووبن. باری کۆمەڵایەتییان (احوالی اجتماعیان)، زمانیان لەهەر تووڕەییێکی سەربەخۆدا بەرەو ڕێکی و شێوەیەکی تایبەتی چووە. تووڕە دراوسێکان لەمانەدا لە یەکتر کاریان (تأپیریان) کردووە. بە وێنە (مپلا) شێوەی زمان و کۆمەڵایەتی دوو عەشیرەتی تەنیشت یەك، لەچاو ئەوانی تردا، پتر لە یەك ئەچوون و دوو عەشیرەتی سەرپەر لەمانەدا لە یەك زۆرتر دوور کەوتوونەتەوە.

ئاریەکان، ئەسپ، گا، مەڕ و بزنیان بەخێو ئەکرد، سەگی پاسیان هەبوو، ئەرەبەیان هەبوو، کە ڕەورەوەکانیان لە کوتکەدارێك تاشرابوو. زۆر ژنداری (تعددي زوجات) پیشەیان بوو. بووك فراندنیان لا باو بوو. گەورەی ماڵ لە ماڵی زەبەردەستی لێ نەپرسراو (حاکم غیر مسئول) بوو. بەکەڵك هێنانی زێڕ، زیو، ئاسن و زەردیان ئەزانی. دەزوویان ئەرست، جلیان ئەدرو و کشتوکاڵیان ئەکرد. ئەشێ نووسین و خوێندنیشیان زانیبێ. دینیشیان عیبارەت بوو لە پەرستشی عەناصری گەیبعییە، وەکوو ئاسمان، ئەستێرە، با... هتد.

وا دەرئەکەوێ کە ئاریەکان کیشوەری ئەورووپایان زۆرتر سازگار دیبووبێ بۆ تێدا بڵاوبوونەوە. لەبەرئەوەیە کە بەشی گەورەیان، ئەم کیشوەرەیان پەسەند کردووە و دەسیان کردووە بە داگیرکردنی هەتا گەیشتوونەتە زەریاکانی قەراغی. بەشەکەی تریان لە دەشتەکانی نیوەڕۆی رووسیەوە بۆ ئاسیا ڕێیان گرتۆتە بەر و هاتوونەتە ڕۆژئاوای ناوەڕاست و ڕۆژئاوای نزیك و هەتا نیوەڕۆی هندستان داگیریان کردووە. ئێمە لەم وتارەدا بەشە ئاسیاییەکە شوێن هەڵئەگرین.

**(٢) کۆچەرەکانی بەرەو ئاسیا:**

وا ئەزانرێ کە عەشیرەتەکانی ئەم بەشە، یەکەم مەڵبەند لە تووڕەی رووباری ئامەویە و سەیحون، واتا (یعنی) لە تورکستانی رووسی ئەمرۆدا، خۆیان گرتبێتەوە. ئەمانە ئەشێ لەم وڵاتە تازەیەیاندا، مودەتێ پێکەوە ژیابن کە لە هەزار ساڵی کەمتر نەبێ. بەڵام ئەبێ لێرەشەوە هۆی زۆردار دیسانەوە کۆچی پێکردبن بەرەو نیوەڕۆ و بانی ئێران و ئەبێ لەم سەربەرە و خواربوونەوەیشیاندا، بەناو ئێراندا لە هەندێ مەڵبەنددا پێکەوە بووبن هەتاکوو جێگایێك کە لەوێدا بوون بە دوو ڕێچکە (قۆڵ). ڕێچکەیێکیان بەسەر هیمالایادا چوون بەودیوا بۆ (هەپتەهیندۆ) کە ئێستا بە پنجاب بەناوبانگە و تێیدا جێگیر بوون. ئەمانە نەتەوەی هندیان دروست کرد. ڕێچکەکەی تر بەناو بانی ئێرانا بڵاوبوونەتەوە و ناونراون ئێرانی. ئەم ئاریە ئاسیاییانە، ئەشێ لە نزیکەی ٢٥٠٠ی پێش میلاددا پێیان نابێتە بانی ئێرانەوە. کاسایەکان، کە لە ١٩٠٠ پ.م. دا (پێش میلادا) لە بابلدا، حکوومەتیان دامەزراندبوو، هەندێ لەناوی خوایەکانیان هیندۆ- ئێرانی بوو. ئەمانە بۆ یەکەم جار ئەسپیان هێناوەتە بابل. لە صەدەی (قرنی) ١٤ پ.م.دا، ناوی شازادەکانی میتانی کە لەبەشی باکووری (شمالی) فوراتدا زەبەردەس بوون ئێسکی (شکلی) هیندۆ- ئێرانی بوو. لە هەندێ وەپائیقی هیتیتدا تەعبیراتی هیندۆ- ئێرانی بە کەڵك هێنراوە لە بابەت تەربیەکردنی حەیوانەوە و بۆ ژمارەی (یەك) وشەی ئەیکە (Aika) بەکار هێنراوە کە هەر خاصی هیندۆ- ئێرانییە. ڕێچکەی ئێرانیش ڕۆژئاوای بانی ئێرانیان گرتبێ و عەشائیری تری ئاریش لە دوای ئەمانەوە هاتبن. ئینجا لە نیوەی یەکەمی صەدەی نۆیەمی پێش میلاد، بەم لاوەیە کە ئەمانە چوونەتە ناو شاخەکانی زاگرۆسەوە.

کوردەکان، لە برانەوەی صەدەی پێنجەمینی پێش میلاددا، لە قەراغی دیجلە بینراون، کسینوفۆن کە لە ساڵی 401ی پ.م.دا، لە مەیانی ئاوی خاپوور و ئاوی باچماندا (ئاوی بتلیس)، بەناویانا ڕابورد بوو. ئەگێڕێتەوە کە کوردەکان لە ژێر حوکمی شای هاخەمەنشی فارسیدا نەبوون و سەربەخۆ بوون. کسینوفۆن، لە پێشا بەناو مادەکانا- کە لای من وایە ئێستا ناویان گۆڕاوە بە کرمانج[1]- تێپەر بووبوو. مادەکانیش لە ڕۆژاوای کەرکووك، هەولێر و لە تووڕەی موصڵدا هەتا قەراغی دیجلە، هاتبوون و لەگەڵ کوردەکانا هاوسنوور بوون.

**(٣) چیرۆکی ئێرانییەکان لە بابەت ئەصڵیی ئاریەکانەوە:**

ئەیریانە وەئیجە (Airyana Vaeja) "بێشکەی ئاریەکان" فەگەردی یەکەم لە نامەی وەندیدا کە یەکێکە لە نامەکانی ئاوێستا، وەها ئەگێڕێتەوە کە یەکەم جێگای زۆر خۆش کە ئەهورە مەزدە خەڵقی کرد "ئەیریانە وەئیجە" بووە، لە ژێر زەبەردەستیی ئێمەدا، کە ئێستا لە دیریکەکانی ئێراندایە، جەم یان جەمشید ناوئەبرێ، ئێرە پڕبوو لە مرۆ، گاگەل، مێگەل، سەگ و مەل و ئاگری گری

[1] * گەلاوێژ (گۆڤار)، بەغداد، ژمارە ١، ساڵی یەکەم، کانوونی یەکەمی ١٩٣٩، ل٩- ١١.

سووردار و هەموو کەس تێیدا بەختیار بوو. لێرەدا نە سەرما هەبوو، نە گەرما و نە نەخۆش هەبوو، نە مردن و نە هیچ خراپییێکی تر. ئێرە بەهەشتێکی ئاریەکان بوو. بەڵام وادیارە لێرە ئاو و هەوا بەجارێ گۆڕاوە. سەرمای زۆر بەتین پەیا بووە، ئیتر زستان دە مانگی پێ چووە و هاوینی هەر تەنیا دوو مانگ ماوەتەوە، کە ئەویش سازگار نەبووە بۆ ئاو و زەوی، درەخت. ئەبێ ئاریەکان لەژێر ئەم زۆرەدا ئێرەیان چۆڵ کردبێ. ئێستا ئێمە نازانین، ئەیریانە وەئیچە، کوێ کەوتووە؟ ئایا خواست لە ئەیریانە وەئیچە وڵاتی ئەصلیی هەموو ئاریەکان بێ؟ یان ئەو جێگایە بێ کە هیندۆ-ئێرانیەکان، لەپاش جوێبوونەوەیان لە بەشی گەورەی ئاری، یەکەم جار تێیدا دانیشتبن، کە وەکوو تورکستانی رووسی بێ، یان جێگایێ بێ هەر عائید بە ئاریەکانی ئێرانی؟ وەرامی ئەم پرسانە ناتوانین بدەینەوە. بوندەهش، کە نامەیەکی پارسییە، کە ئەڵێ زەردەشت لێرەدا لە دایك بووە، ئێرە ئەخاتە تەنشت ئازەربایجانەوە. ئارمستەری زانا ئیدعا ئەکا کە "قەرەباغ" بووە. هەندێ زانای تر ئەڵێن کە توورەی سەیحوون وجەیحوون بووە، کە ئەمە لەلای من مەعقول ترە. هەر کوێیێ بووبێ، دیارە کە ئێرانیەکان بە چۆڵکردنی ئەو وڵاتەیان، زۆر دڵگیربوون کە لە بیریاندا لە پاشا بووەتە جێگایەکی ئەساگیری.

**(٤) هیندۆ-ئێرانی:**

ئەو عەشیرەتە ئاریانە کە هاتوونەتە ئاسیاو کە لەبەرەوە لە هەزار ساڵ پتر پێکەوە دەمبوێر (زمان گـــژار، دم گـــژار) بوون، لەم مودەتەدا لە چاو ئاریەکانی تردا کە بەناو ئەوروپادا بڵاوبوونەتەوە، لە زمان و دین و یاسادا (عەنعەناتدا) هەندێ خصوصیاتی موشتەرەکەیان پێکەوە پەیاکردووە، سەرەرای ئەو خصوصیەتە کە هەر عەشیرەتی سەربەخۆ لەمانەدا هەیبوو. واش دیارە کە عەشیرەتێکی زەبەردەست زمان و کۆمەڵایەتیی تایبەتیی خۆی لەناویانا سەرخستبێ. ئەم ئاریانە کە ئێستا لەیەك جوێ بوونەتەوە و لە دوو وڵاتی جوێجوێی وەکوو هندستان و ئێراندا جێگیربوون، بەپێی ئەو خصوصیاتە موشتەرەکەیانەوە کە لە زمان، دین و یاسادا هەیانە و کە بنجەکانیان لەسەردەمی گردی یانەیە، لەلایەن زاناکانەوە بەناوی هیندۆ-ئێرانی ناوئەبرێن. وە ناویان بۆ ئەو سەردەمەی گردیشیان، دیسانەوە هیندۆ-ئێرانی نراوە. بەڵام خۆیان لەو دەمەدا کە پێیان ئەنایە هندستان و ئێرانەوە خۆیان بە ئاری ناوئەبرد.

---

* گەلاوێژ (گۆڤار)، بەغداد، ژمارە ٢، ساڵی یەکەم، کانوونی دووەمی، ١٩٤٠، ل١٣-١٩.

ئەبێ ناوی (ماد) لەناو کوردەکانا (مار) بێژرابێ و لەپاشا گۆڕابێ بە (کرم) و لە ئەنجامدا بە (کرمانج). (کرم-انج) ماناکەی سەر بە کرمە (مەنسوبی کرمە)، کرمشییە. ئەشێ ئەوانەی نامەی ئەرتەخشیری پاپەکان کە بە زمانی پەهلەوی نووسراوەتەوە و شانامە بە کرم یان مار و بە پەرستشکار و مەنسوبی کرم، یان ماریان ناوئەبەن و لە ئێسکی چیرۆکدا شەری مەیانی ئەردەشیری بابەکان و ئەوانمان بۆ ئەگێڕنەوە، مادەکان بن کە لە پێش سەردەمی نووسینەوەی ئەم چیرۆکانەدا بە کرم و سەر بە کرم بەناوبانگ بووبن کە وشەی کرمانج عەینی مانا ئەدا. چەند ساڵێکە ئیپباتی ئەم مانایەی (کرمانج)م دوور و درێژ نووسیوەتەوە و ئامادەیە بۆ بڵاوکردنەوە.

**ساڵح زەکی، تۆفیق وەهبی، ئەحمەد میرخاس، شێخ نوری شێخ ساڵح، ئەمین رەواندزی، رەشید سدقی غەفوور**

# بنج و بناوانی زمانی کوردی لە توێکڵە گوێزێکدا

ئەو خوێندەوارانەی بڵاوکراوەکانی ئەم دواییەی زمانی کوردی شوێن کەوتوون، ئەبینن کە ئەو وشە بێگانانەی لە سەردەمی دوور و نزیکەوە جێگیربوون لە زمانەکەماندا، بەرە بەرە جێی خۆیان بەرەڵلا ئەکەن بۆ وشەی کوردی، وە بەرامبەر بەو وشە تازانەش کەوا بە پێویستی زانست و هونەر و پیشەی باوەوە تازە دائەهێنرێن لە گێتیدا، وشەی کوردی پەتی خراوەتە کار، پڕ بە مانای خۆی.

گەنجینەی زمانی کوردی، لە هەموو فەرهەنگێکی زمانەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیك پڕترە لە گەوهەر. من بیست ساڵێك ئەبێ کە بە چاوێکی پشکنین و دەسکی چنینەوە بەناو ئەم گەنجینەدا ئەسووڕێمەوە. لەپاش ئەوە کە گەلێ لە گەوهەرەکانیم جوێ کردەوە و گەردم سڕین و لێکم دانەوە و پەیم بە بنج و بنەوانیان برد، تێگەیشتم کە ئەم گەنجینەیە، ئەو زمانەیە کە دەمی خۆی زمانی دینێك بووە، شارستانیەتی هەرە بەرزی داداوە، ئەو زمانەیە کە ئاوێستای پێ نووسراوەتەوە، ئەو زمانەیە کە زەرەئوشترە (زەردەشت) "گاپا"کانی پێ نووسیوەتەوە.

گەوهەرەکانی ئەم گەنجینەیە کە ئاوێستا چوار هەزارێکیانی بۆ شاردووینەتەوە، لە ئێسکە کۆنەکانیاندا، ئەمڕۆ لە ئێسکێکی باویاندا لە ژێر دەسمانان. بەڵام داخم ناچێ، گەلێکیانمان وەك دراوێکی لە ڕەواکەوتوو لە کون و قوژبندا، فڕێ داوە و دەسمان درێژ کردووەتە دارێژراوی بێگانە.

ئامانجم لە بڵاوکردنەوەی وتارەکانی "بنج وبناوانی زمانی کوردی" لە (گەلاوێژ)ی خۆشەویستدا، ئەوە بوو کە بچینە ناو ئەم گەنجینەوە، وە پێکەوە بە شێنەیی تێیدا بسووڕێینەوە. کەچی لەپاش بڵاوکردنەوەی وتاری نۆیەم، وەها ڕێکەوت کە خەریکی هەندێ کاروباری تر ببم، وە بە دەمێ (موقتاً) دەس لەوان هەڵگرم. بەڵام هەمیشە بەداخەوە دێم و ئەبینم کە کوردەکان، زمانەکەی خۆیان ئەبەنەوە سەر زمانی پەهلەوی، وە بە پەهلەوییەوە ئەنازن. لەبەرئەوە بە پێویستم زانی، لە بەرەوە هەندێ زانیاری لەبارەی تیرەی زمانەکەمانەوە بڵاو بکرێتەوە. لە وتاری چوارەممانا١ لە باسی دروستبوونی شێوەکانی کوردی و باسی وشەی "کرمانج"دا، زانیارییێکی زۆر کورتی بە کەڵکم بڵاو کردبووەوە لە بارەی تیرەی زمانی کوردیەوە. پیشانم دابوو کە زمانی کوردی لە تیرەی زمانی فارسیی کۆن -پەهلەوی- فارسیی تازە نییە. ئەم وتارەشمان کورت ئەبێ، بەڵام ئەو زانیارە گشتیانەی تێدا ئەبێ کە زانینیان پێویستە لەبارەی تیرەی زمانەکەمانەوە.

### نەتەوەکانی هیندۆ-ئەوروپایی

بەرەی زمانی هیندۆ-ئەورووپایی

ئەو نەتەوانەی ئێستا لە ئەوروپا و ئاسیادان و گەلێ شوێنی هاوبەشیان هەیە، چی لە زمان و چی لە دین و هەتا چی لە یاساشدا، کە لە سەردەمی گردبیانەوە لە دەشتەکانی نیوەڕۆی رووسیەدا، بۆیان ماوەتەوە، پێیان ئەڵێن: هیندۆ-ئەورووپایی. زمانەکانی نەتەوەکانی هیندۆ-ئەورووپایی بەسەر یەکەوە پێیان ئەڵێن بەرەی زمانی هیندۆ-ئەورووپایی، کە زمانە کۆن و تازەکانی «هیندستان» و «بانی ئێران» (کەوا لە خوارەوە لێیان ئەدوێین)، وە هینەکانی ئەوروپا ئەگرێتەوە.

هیندۆ- ئێرانی

### لکی زمانی هیندۆ- ئێرانی

ئەو بەشەی هیندۆ-ئەورووپاییە کە بەسەر «ئۆڕاڵ»ەکاندا بۆ ئاسیا هاتوون، وە لە پاش ئەوە کە هەزار ساڵ پێکەوە وادیارە لە ڕۆژهەڵاتی زەریای قەزویندا رایان بواردبێ، بوون بە دوو ڕێچکە و ڕێچکەیەکیان بەسەر کێوەکانی هیمالایادا بەرەو خوار بووەتەوە بۆ هیندستان، وە ڕێچکەکەی تریان ٢٠٠٠ ساڵێ لەپێش میلاددا، بەناو ئێراندا بڵاو بوونەوە، لەبەرئەوە خزمایەتیە توندەی ئەو سەردەمی پێکەوە بوونەیان کە لە زمان و دین و یاسای هەر دوولایاندا ئەبینرێ، پێیان ئەڵێن هیندۆ-ئێرانی. «زمانەکانی هیندۆ-ئێرانی» بەسەر یەکەوە لکێکە لە بەرەی زمانی هیندۆ-ئەورووپایی. تەعبیری زمانی هیندۆ-ئێرانی، هەموو ئێسکە هەرە کۆنەکانی زمانەکانی ئەم لکە ئەگرێتەوە کە شوێنیان لە هەندێ نامە و بەردی نووسراودا ماوەتەوە، لەگەڵ ئێسکی هەرە تازەی ئەو زمانانە کە بریتین لە گۆڕانیان هەتا ئەمڕۆ.

لکی هیندۆ-ئێرانی، سێ زمانی لە ئێسکی کۆنیاندا بۆ شاردووینەتەوە:

١. «ویدایی» کە سەر بە هیندستانە.

١- گەلاوێژ (گۆڤار)، ساڵ ١، ژمارە ٥و٦، بنج و بناوانی زمانی کوردی

٢. «فارسی کۆن» کە سەر بە بانی ئێرانە.
٣. "ئاوێستایی" کە سەر بە بانی ئێرانە.
بەرەی زمانی "ویدایی": بەرەی زمانی ویدایی بریتییە لەم زمانە کۆن و تازانەی خوارەوە:
١. "ویدایی"یە کە زمانی چوارنامە دینیەکانی هیندین کە هەرە کۆنیان "ریك ویدا"یە.
٢. "سانسکریتی" یە کە دوو داستانە گەورەکەی "مەهابهاراتا" و "رامایانە"ی، وە قانوونی مانو، نامە پیرۆزەکان و هەندێ نامەی یاریی پێ نووسراوەتەوە. هەتا سەدەی شانزەمینی میلادی، ئەم زمانە نووسراوەتەوە. سانسکریتی لە ویدابیەوە بووەتەوە.
"پراکریتی"یە کە شێوەکانی لە ویدابیەوە بوونەتەوە.
زمانە تازەکانن کە لە شێوە پراکریتیە کۆنەکانەوە هاتوونەتە خوارەوە: پەنجابی، سندهی، کوچەراتی، مەراتهی، هندی، بەهاری، بەنگالی، ئەوروپا... هتد. زمانی هیندی کە ئوردوو یان هیندستانی ناونراوە، وشەیەکی زۆری عەرەبی و فارسی تێکەڵ بووە.

**بەرەی زمانەکانی "بانی ئێران"**

**یادگاری هەرە کۆنی ئەم زمانانە لەگەڵ نەوە کۆن و تازەکانیان ئەمانەن:**

١. زمانی ئاوێستایی کە زمانی نامەی دینی زەردەشتەکانە، وە زمانێکی پەتییە، وادیارە کە زمانی مادەکان بووبێ.
٢. زمانی بەردەنووسەکانی شایەکانی هەخەمەنشی کە ئێستا بە فارسیی کۆن ناو ئەبرێ.
٣. زمانی چەند سکەیێکی دوا سەردەمی ئەشکانیەکان و زمانی بەردەنووسەکانی شایەکانی ساسانی و زمانی هەندێ نامەی سەردەمی ئیسلامی کە ئێستا بە پەهلەوی بەناوبانگە.
٤. زمانە تازەکان کە بریتین لە کوردی، فارسی، ئەفغانی، بلووچی، ئوسسەتی، گەلچەیی و هەندێکی بچووکتر.

**خزمایەتیی زۆر نزیکی ویدایی و ئاوێستایی و فارسیی کۆن:**

ئەم سێ زمانە کۆنە، ئەوەندە نزیك بەیەکن کە هەندێ زانا لەپێشا وای بۆ چووبوون کە زمانی ئاوێستایی شێوەیەکی زمانی ویدایی هیندستانی بێ. بەراستی ئەم سێ زمانە سەربەخۆیە، بە پلەیێ لێك نزیکن کە وشەکانی هەرکامێکیان بە هەندێ دەستووری دەنگی و وشەوانییەوە، ئەتوانرێن بخرێنە ئێسکی بەرامبەرەکانیانەوە، لە دوو زمانەکەی تردا.
لە بەری سەردەمی شایەتیی هەخەمەنشیەکاندا، واتا لە سەدەی شەشەم و پێنجەمی پێش میلاددا کەسێکی سەر بە زمانی ئاوێستایی ئەبێ توانیبێتی ڕاستەوخۆ، بە ئاسانی بە زمانی خۆی لەگەڵ پارسییێکدا بئاخێوێ (قسە بکا). "سترابۆ" (بەری یەکەم سەدەی میلادی) ئەگێڕێتەوە کە مادەکان و پارسەکان بێ تەرجومان لە زمانی یەك ئەگەیشتن.

٢(٢)*

**کۆمەڵە**

**زمانەکانی باڵی ئێران- فارسی کۆن**

زمانی فارسی کۆن بەو زمانە ئێرانیە ئەڵێن کە شایەکانی هەخەمەنشی[3] هەندێ بەردیان پێ کۆڵیوە. هەرە کۆنی ئەم کۆڵیارانە، ئەم چوار وشەیەیە کە بەسەر گۆڕی "کۆرش"ـەوە (٥٥١-٥٢١ پ.م) بۆمان بەجێ ماوە: ((ئەدەم کۆروش خشەیەییە هەخەمەنیشیە))، ماناکەی بە کوردی ((ئەز کۆروش، شا، هەخەمەنشی))ـە. هەرە تازەی ئەم کۆڵیارانە



٢ * گەلاوێژ (گۆڤار)، بەغداد، ژمارە ٤، ساڵی٤، نیسانی ١٩٤٣، ل٣٥-٣٨.
٣ «هەخەمەنشیەکان»، خانەدانێکی فارسی پەتی بوون، هەرگیز «ماد» نەبوون. خانەدانی هەخەمەنشی خانەدانێکی ئەفسانەیی نییە، دیریکییە (تاریخییە). «کەیانیان»یش «ماد» نەبوون. لەئایندەدا هەندێ زانیاری روون کەرەوەتان بۆ بلاوئەکەمەوە لەبارەی «پیشدادیان و کەیانیان»ـەوە، کە دوو چینی (شا)یی ئەفسانەیین. سەرچاوەکانی ئەم زانیارانە بە هەزاران ساڵ کۆنترن لەشانامە.

هینەکانی "ئەردەشێری سێیەم"ن (٣٦١-٣٣٦پ.م).

ئەم زمانە کە بە تیپی مێخی کۆڵراوە، وە لەگەڵ ئاوێستایی و ویدایی دا سێ تووڵی لکێکن، لە هەموو زمانێکی تری بانی ئێران، پتر نزیك بە فارسیی ئەمڕۆیە، لەبەر ئەوەیە کە ناونراوە «فارسیی کۆن». فارسیی کۆن، زمانی نیوەڕۆی ڕۆژاوایی بانی ئێران بوو.

پیاو کە ئەم بەردەنووسانە ئەخوێنێتەوە، ئەبینێ کە لە ناو ئەو دووسەد ساڵەدا کە ئەم بەردەنووسانە کۆڵراون، زمانەکە دەسی کردووە بە سوان و ئاسانتر بوون. لە چەشنی نووسیار و ڕێکخستنی قسەکانی کۆڵیارەکان وا دەرئەکەوێ کە ئەم زمانە لە پێش سەردەمی ئەم شایە فارسیانەدا، پێی نەنووسرابێ. لە زمانی فارسیی کۆن، ئەوەی لەو بەردانە دەسمان کەوتووە لە چوارسەد وشە تێپەڕ ناکا.

## پەهلەوی

وشەی «پەهلەوی» لە وشەی «پەرپەو»ەوە گۆڕاوە، کە ناوی نەتەوەی «پەرپ»ـە. «پەهلەوی» مانای سەر بە «پەهلەو»ە. وشەی «پەهلەوان» گەلی ناوەکەیە، ئێستا وەك تاك بەکارئەهێنرێ. کەوابوو زمانی پەهلەوی» ئەبێ ماناکەی زمانی نەتەوەی «پەهلەو» بێ کە شایەکانیان لە شانامەدا بە ناوی (ئەشکانیان) ناو براون.

ئەشکانیەکان یان پەهلەوەکان، لەپاش هەخەمەنشیەکان، وە لەکاتی سەردەمی ماکەدونیاییەکاندا، لە ئێران پەیا بوون (٢٤٩پ.م)، چوار سەدە و نیوێك حکومەتیان کرد لە ئێراندا، وە بە دەسی دامەزرێنەری خانەدانی ساسانی «ئەردەشیری پاپەکان» لەناو چوون (٢٢٦پ.م).

وشەی پەهلەوی خۆی لە ئێراندا، لەبەری سەردەمی ئیسلامیەوە، تەعبیرێکە، ئەو ڕەنگ و شکۆ و یاسا و ئەدەبیاتی فارسیی پێش سەردەمی ئیسلامی دێنێتە بیر، وە لەناو فارسەکاندا زۆر پێوە نازراوە. بەڵگەیێکی تازەی ئەمە ئەوەیە کە ڕەچا شا کە بوو بە شای ئێران، ئەم عینوانە پێوە زانراوەی وەرگرت بۆ خۆی.

ئێمە، سەر بە زمانەکانی سەردەمی ئەشکانیان و ساسانیان کە پێیان ئەڵێین «پەهلەوی» ئەمانەی خوارەوەمان دەس کەوتووە:

دانیشتوان لەڕاستەوە:

١- غەفور مەلا مارف، ٢- حاجی ئەحمەد ناسراو بە(حاجی ئەحە ڕەش)، ٣- تۆفیق وەهبی*

٤- ؟، ٥- محەمەد بریفکانی

ڕیزی پشتەوە:

١- ئیبراهیم فەرەج شاڵی . ٢- ڕەمزی مەلا مارفی شاعیر . ٣- ؟

مێژوو: سەرەتای ساڵانی پەنجاکانی سەدەی بیستەم .

شوێن: ماڵی ڕەمزی مەلا مارفی شاعیر .

بۆنە: سەردانی تۆفیق وەهبی بەگو محەمەد بریفکانی لە بەغداوە بۆ سلێمانی .

هەندێ پارچەی نووسراوی دینی «مانی»، کە سەر بەدوایی سەردەمی ئەشکانیەکان و بەری سەردەمی ساسانیەکان. ئەمانە دوو زمانی بانی ئێرانی پەتییان تێدایە کە یەکێکیان وا زان ئەکرێ زمانی باکوور، یان باکووری ڕۆژاوایی بانی ئێران بووبێ، وە زمانی ڕەسمی ئەشکانیەکان بووبێ. ئەوی تریان زمانی فارسی ساسانیەکانە.
هەندێ سکە و مەدالیەی شایە دواییەکانی ئەشکانی کە بە خەتێکی سامی و زمانێکی تێکەڵ و بە زمانێکی سامی نووسراون.
چەند بەردەنووسێکی شایەکانی ساسانی کە ئەمانیش هەرچەندە تێکەڵ بە زمانێکی سامیین و بەتیپی سامی نووسراونەتەوە، بەڵام هەندێکیان سەر بەو زمانەی باکووری ڕۆژاوابیەیە کە لەناو پارچەکانی "مانی"دا دۆزراوەتەوە، وە هەندێکیان سەر بە زمانی فارسیی ساسانیین.
گەلێ کتێب کە بەشێکیان تەرجومە و تەفسیری ئاوێستایە کە بە "زەند ئاوێستا" بەناوبانگە، بەشێکیان نامەی ئایین و کاروباری دینین، وە هەندێکیان دیریك و چیرۆکن، ئەمانە سەر بە زمانی فارسیی ساسانیین.
بەپێی ئەمانەی سەرەوە، دوو چەشن زمان هەیە کە پێیان ئەڵێن "پەهلەوی":
زمانی باکووری ڕۆژاوایی (پەهلەوی ئەشکانی).
زمانی نیوەڕۆی ڕۆژاوایی (پەهلەوی ساسانی).

* (٣)

## ناوی "پەهلەوی" بە چۆن زمانێک دراوە، وە ئەبێ کەی پێی درابێ؟

لە سەرەوە وتوبوومان کە "پەهلەوی" مانای سەر بە "پەهلەوەکان"ـە، وە بەپێی ئەمە "زمانی پەهلەوی" ماناکەی "زمانی نەتەوەی پەهلەو" ئەبێ کە شایەکانیان لە (شانامە)دا بە "ئەشکانیان" ناوبراون. بەڵام بەڕاستی نە لە سەردەمی ئەشکانیدا وە نە لە سەردەمی ساسانیەکاندا، نابێ ناوێکی وەها بەکارهێنرابێ بۆ زمانەکانی هەرێمی مادستان (کوردستان) و فارسستان.
ئەو زمانەی ناونراوە "پەهلەوی" ئەو زمانە سەمەرە (عەجایەب) دەسکردەیە کە هەندێ سکە و مەدالیەی شایە دواییەکانی ئەشکانی و کۆڵیارەکانی ساسانی، وە زەند-ئاوێستا و نامە دینیەکان و هەندێ نامەی تری پێ نووسراوەتەوە. ناوی پەهلەوی کە تەعبیرێکی پێوە نازراوی سەردەمی ئیسلامییە، ئەبێ لەسەردەمی ئیسلامیدا درابێ بەم نووسراوانە، بەم یادگارە باستانیە بەشکۆ و پیرۆزانە.
زمانی پەهلەوی زمانێکی دەسکرد و واق وڕهێنە، بە تێکەڵ کردنی سامی، وە ئێرانی پێش ئیسلامی دروست کراوە، وە بە تیپێکی سامی نووسراوەتەوە. بە وێنە، "یەقتەلونتەن" مانای "کوشتن"، وە "یەکتەبونتەن" مانای "نووسین"ـە. عەبدوڵڵای ئیبنی موقەفەع کە لە ساڵی ١٧١ی هیجریدا مردووە، ئەگێڕێتەوە کە هەزار وشەیەکیش بووە، هەر ڕاستەوخۆ بە ئارامی ئەنووسران و بە فارسی ئەیان خوێندنەوە. بە وێنە، "برسا"یان ئەنووسی، "گۆشت" یان ئەخوێندەوە. ئەم شفرەیە پێیان وتووە "زوراش٤".

## زمانی باکوور، یان باکووری ڕۆژاوایی (پەهلەوی ئەشکانی)

شایە پەهلەویەکان، واتا شایەکانی ئەشکانی کە ئەکەونە ناوەڕاستی هەخەمەنشیەکان و ساسانیەکانەوە، بەپێچەوانەی ئەم دوو خانەدانە فارسیەی بەرەوە و دوواوەیان، شتێکی ئەوتۆیان بۆ بەجێ نەهێشتووین سەر بە زمانەکەیان، لە هەندێ سکە و مەدالیە بەولاوە کە ئەمانەش لە شایە دواییەکانیانەوە ماونەتەوە.
زمانە دەسکردەکەی ئەم سکە و مەدالیانە، لەگەڵ زمانی پەهلەوی، لەگەڵ هەندێ لەبەردە نووسەکانی شایە بەریەکانی ساسانی لە چەشنێکن. ئەم زمانە هەرچەندە بە تیپێکی سامی نووسراوە و تێکەڵ بە زمانێکی سامییە، بەڵام جیاوازی هەیە لەگەڵ

---

٤ * گەلاوێژ (گۆڤار)، بەغداد، ژمارە ٧، ساڵی٤، تەمووزی ١٩٤٣، ل٤٣-٤٦.

پەهلەوی، هەندێ بەردە نووسی تری شایەکانی ساسانی و کۆمەڵە نامە دینی و دێریکی و چیرۆکیەکانی دواییدا. ئەم زمانە هەر لەبەر ئەم جیاوازیەی بوو کە ناونرابوو «کەلدو-پەهلەوی» کە ناوێکی ناساز بوو بۆی٥.
بەڵام لەم دواییەدا لە «تورفان»دا کە لە تورکستانی چینیدایە، هەندێ پارچەی نووسراوی دینی «مانی» دۆزرایەوە. ئەم نووسراوانە بە چەند زمانێکن، وە گشتیان بە پێچەوانەی یادگارەکانی ئەو سەردەمانە، راستەوخۆ بە ئێرانی پەتی نووسراوەتەوە، لەگەڵ ئەمەشا کە بە تیپێکی سامی نووسراونەتەوە. زمانی ئەمانە ئێرانیە پەتیەکەی ئەو زمانە دەسکردە تێکەڵ بە سامیەیە کە هەتا ئێستا بە «کلدو-پەهلەوی» ناو ئەبرا. لەپاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر، دەرکەوت کە ئەم زمانە پەتیە، زمانێك بووە سەر بە باکوور یان بە باکووری رۆژاوایی ناوچەی بانی ئێران، وە ناو نرا «زمانی باکوور یان باکووری رۆژاوایی». وا زان ئەکرێ کە ئەم زمانە پەتیە، زمانی ئەشکانیەکان بووبێ. کەوابوو ئەو ئێسکەی تێکەڵ بە سامیەی ئەم زمانە «کە هەتا ئێستا پێیان ئەوت: کلدو-پەهلەوی»، شیاوترە ناوبنرێ «پەهلەوی ئەشکانی».



## زمانی نیوەرۆی رۆژاوایی «پەهلەوی ساسانی»

هەتا ئەم دواییە هەر ئەو زمانە دەسکردەکەی کە بەشێ لە بەردەنووسەکانی شایەکانی ساسانی و زمانی زەند-ئاوێستا و نامە دینی و دێریکی و چیرۆکیەکانی تر بوو، کە پێیان ئەوتن «پەهلەوی». بەم زمانە دەسکردە هەتا سەدەی پانزەمی میلادیش، نامە نووسراونەتەوە.
لە پارچەکانی دینی مانی کە ئەم جارە دۆزراونەوە، وە کەوا دیارە لە بەری سەردەمی ساسانیەکاندا بە ئێرانی پەتی نووسراونەتەوە، دەرکەوت کە بەشێکیان ئێرانیە پەتیەکەی ئەم پەهلەویەیە، وە راستەوخۆ زمانی فارسی سەردەمی ساسانیەکانە. وە چونکە زمانی فارسی، زمانی هەرێمی فارسستانە لە ئێراندا و ئەم هەرێمە کەوتۆتە نیوەرۆی رۆژاوای بانی ئێرانەوە، زمانی ئەم پارچانەی دینی مانی ناونران «زمانی نیوەرۆی رۆژاوایی».
ئەم زمانە گەلێ تەعبیری دینی، سیاسی، کۆمەلایەتی، پزیشکی، جەنگی و هیی تر، فیعلی وەرگرتووە لە زمانی «باکووری رۆژاوایی ناوچەیی»ـەوە، کە زمانی ئەشکانیەکان بووە. ئەشێ کە ناوی «پەهلەوی سانی» بمێنێ بۆ ئێسکە پەهلەویەکەی ئەم زمانە.

## تیرەی زمانی فارسی

زمانی فارسی کۆن، وەکوو وتمان هەر لەسەردەمی هەخەمەنشیەکانەوە، دەسی کردووە بە سوان و ئێسکی خۆ گۆڕین. لە رۆژی لەناوچوونی هەخەمەنشیەکانەوە (٣٣٦پ.م) هەتا پەیابوونی ساسانیەکان کە بریتییە لە ٥٥٠ ساڵێك، سەر بە زمانی فارسی کۆن، هیچمان بۆ نەماوەتەوە. ئێستا زمانەکە لە ئێسکێکی زۆر تازەدا، کە سەر بە بەری سەردەمی ساسانیەکانە، سەری هەڵدایەوە، بە راستی زمانی فارسی سەردەمی ساسانی «زمانی نیوەرۆی رۆژاوایی»، زمانێکە لە فارسی هەخەمەنشیەوە هاتۆتە خوارەوە. ئەم زمانە، وەکوو لە فارسیی کۆن گۆڕاوە بە فارسیی سەردەمی ساسانی، وە فارسیی ساسانی گۆڕاوە بە فارسیی تازە. ئەوەندە هەیە فارسی کۆن تووشی گۆڕانێکی زۆر هاتووە، تا بووە بە فارسیی ساسانی، لەچاو ئەو گۆڕانەی فارسیی ساسانی، زۆر راستە کە پێشی ئەڵێن «فارسیی ناوەڕاست». ئینجا بەپێی ئەم زانیارانەی سەرەوە، تیرەی زمانی فارسی ئەمەیە:
فارسی کۆن - فارسیی ناوەڕاست (فارسیی ساسانی)- فارسیی تازە. پازەند، پارسی.
لێرەدا پێویستە مانای دوو ناوی تر روون بکەینەوە:
ئ. پازەند: ئەو زەردەشتیانەی هەڵاتوون بۆ هیندستان، هێناویانە ئەو کتێبە دینیانەی وەکوو زەند ئاوێستا... هتد، بێ، بە تیپی ئاوێستا کە تیپێکی زۆر چاکترە لە تیپی پەهلەوی بۆ نووسین. وە بە زمانی فارسیی ساسانی، بە چەشنێ کە لە بیریانا

٥ -لە بارەی ئەم زمانەوە، هەندێ زانیارم نووسیبوو لە وتاری دەیەمی «بنج و بناوانی زمانی کوردی»دا لە گەلاوێژ، ساڵی ٢، ژمارە ٣و٤ دا، بیان خوێننەوە. ژمارەی ئەو وتارانە کە بلاوکراونەتەوە (١٠)یە، نەك (٩).

مابۆوە، نووسیوەتەوە، وە ئەم کتێبانەیان کە بەم چەشنە لە شفرەی «زۆارش»و تێکەڵیی ئارامی ڕزگار کردووە، ناو ناوە «پازەند»ە.

ب. پارسی: لەپاش سەردەمێکی تر هێناویانە ئەم پازەندانەیان بە تیپی عەرەبی نووسیوەتەوە. بە زمانی ئەو نووسراوانەش ئەڵێن «پارسی».

## زمانی ئاوێستایی

زمانی ئاوێستایی بەو زمانە ئەڵێن کە «ئاوێستا»ی پێ نووسراوەتەوە. ئاوێستا نامەی دینیی زەردەشتیەکانە. لە رووی ئەو چارەنووسە دیریکیانەوە کە لە بانی ئێراندا قەوماوە، گەلێ بەشی ئاوێستا لەناوچووە. لەو پارچانەی بۆمان ماوەتەوە، «گاتەکان» لە هەموویان کۆنترە. وا زان ئەکرێ کە زەردەشت خۆی ڕێکی خستبێ. پارچەی هەرە تازەیشی کە پارێزراوە «وردە ئاوێستا»یە، کە لە بەری سەدەی چوارەمی میلادیدا نووسراوەتەوە. لە مەیانی کاتی ڕێکخرانی گاتەکان و وردە ئاوێستادا، هەزار ساڵ پتر -ئەشێ دوو هەزار ساڵ- هەیە. لەبەرئەوە، شێوەی گاتاکان جیاوازی هەیە لەگەڵ هی بەشە تازەترەکاندا. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەم جیاوازیە ئەوەندەی جیاوازیی مەیانی زمانی فارسیی ناوەراست (فارسی سەردەمی ساسانیەکان) نییە، کە هەر پێنج- شەشسەد ساڵێکیش لەمەیانایە. چونکە فارسی کۆن، زمانێکی دینی و ئەدەبی نەبوو، وە هەر زمانی قسەکردن بوو. لەپاش هەخەمەنشیەکان کەس پێی نەنووسیەوە. وە کاتێ دەس کرایەوە بە بەکارهێنانی لە نووسیندا، تووشی ئەو گۆڕانە گەورەیە بوو بوو، کە لە پێشەوە وتمان.

بەڵام ئاوێستا نامەیەکی دینی بوو، وە ئەبوایە بنووسرایە وە بپارێزرایە. ئەو کەسانە کە نووسینەوە و پاراستنی ئاوێستایان گرتۆتە خۆیان، ئەوەندەی پێیان کراوە، ئێسکی کۆنی زمانەکەیان پاراستووە. لەگەڵ ئەمەشدا وەکوو وتمان جیاوازی هەیە لە مەیانی شێوەی پارچەی کۆن و تازەترەکانی ئاوێستادا. ئاوێستا، ئەوەندەی سانسکریتی بەختیار نەبووە کە کاتی خۆی کەسێ هەڵکەوێ و دەستوورێك بۆ زمانەکەی بکا، زۆری لەبەر کەم ڕەواجی دینی زەردەشتی لە سەردەمی هەخەمەنشیەکان، وە بە تایبەتی لەبەر لەناوبرانی چەند کەرت و بەشێکی ئاوێستا و کزبوونی دینەکە لەپاش داگیرکرانی ئێران لەلایەن ئەسکەندەرەوە. بەڵام زمانی ئاوێستایی لە قسەکردندا ئەویش وەکوو زمانی فارسی کۆن- تووشی سوان و گۆڕانێکی گەورە بووە. کاتێ کە دینەکە سەرکەوت و دەسیکرد بە بڵاوبوونەوە، لەسەردەمی ساسانیەکاندا، ئەو زمانەی ئاوێستای پێ نووسراوەتەوە، لەسەر زاری مرۆڤدا وەکوو خۆی نەمابوو. لەبەرەو دوایی نووسرانی ئاوێستادا، واتا لە بەریی سەردەمی ساسانیەکاندا، وەکوو فارسێك لە فارسیی کۆن نەئەگەیشت، ئەو نەتەوەیەش کە خۆی بە ئاوێستایی قسەی ئەکرد، نەیئەتوانی لە پارچەی هەرە تازەی ئاوێستا بگا، بێجگە لە پیاوە دینیەکان کە بە تایبەتی ئەیان خوێند و فێری ئەبوون. هەر لەبەر ئەمە بوو کە تەفسیری ئاوێستا نووسرایەوە بە پەهلەوی. فەرامۆش کرانی زمانی نووسینی ئاوێستایی گەیشتە پلەیێ، کە ئیتر مرۆڤ زمانی پەهلەوی

ساسانی، کە دەسکردێکی تێکەڵ بە ئارامی بوو، بە زمانی زەردەشت خۆی تێئەگەیشتن.

## دوو جیاوازی گرنگی میانی زمانی ئاوێستایی و فارسیی کۆن

لە دەنگەکانی زمانی ئاوێستایی و فارسی کۆندا، کە دوو زمانی زۆر نزیك بە یەکن، هەندێ جیاوازیی سروشتی هەیە، کە لەمانە دووانیان زۆر گرنگن بۆ دۆزینەوەی تیرەی هەردوو لایان. تیرەی فارسی کۆن دۆزراوەتەوە کە وەکوو لە سەرەوە وتمان، فارسی تازە ئەچێتەوە سەر ئەو. بەڵام تیرەی ئاوێستایی، هێشتا شوێنی هەڵنەگیراوە. ئینجا بۆ لێکۆڵینەوەی تیرەی ئاوێستایی پێویستە کەڵك لەم دوو جیاوازییە سروشتیە بگرین، کە ئەمانەن:

١. هەموو دەنگێکی "د"ی فارسیی کۆن کە بەرامبەرەکەی لە سانسکریتیدا، "ج" یان "ه"بێ، ئەبێ لە ئاوێستایدا بەرامبەرەکەی "ز"یە، وەکوو:

ئـ. ئەو "د"ە فارسیە کۆنانە کە بەرامبەر بە "ج"ی سانسکریتین:

| فارسی کۆن | سانسکریتی | ئاوێستایی |
|---|---|---|
| دەوشنەر، (دۆست) | جۆش، (خۆشویستن) | زوش، زەوشە، (خۆشەویستی) |
| دەرەیە، (بەحر) | جرەیە | زەرەیو |
| ئەدانا، (ئەیزانی) | جانانی، (زانی) | زاتنتی |

ب. ئەو "د"ە فارسیە کۆنانە کە بەرامبەر بە "ه"ی سانسکریتین:

| فارسی کۆن | | |
|---|---|---|
| دەستە، (دەست) | هەستە | زەستە |
| دیدا، (قەلاَ) | دەهی | دز |
| ئەدەم، (ئەز) | ئەهەم | ئەزم |

هەندێ "ش"ی ئاوێستایی بەرامبەر بە "رت"ی فارسیی کۆنە، وەکوو:

| فارسی کۆن | ئاوێستایی |
|---|---|
| مەرتیە، (پیاو) | مەشیە |
| فەرەڤەرتی | فەرەڤەشی، (فریشتەی پارێزگار) |

کۆڵیارەکانی "پەیکوڵی" کە لەسەر رێگای هەڵەبجە و کفرییە، بە هەردوو چەشنە پەهلەویەکە نووسراونەتەوە.

# لێبوونەوەی ناوی کەرکووك

## (اشتقاق اسم كركوك)[1]*

تۆفیق وەهبی

1- * شەفەق (گۆڤار)، کەرکووك، ژمارە سێ، ساڵی یەکەم، نەورۆز (مارت)ی 1958، ل4-5.

یاقووت لە «معجم البلدان»دا نووسیویە: «کرخینی، هی قلعە فی وطأة من الارض حسنە حصینە، بین دقوقا و إربل، رأیتها وهی علی تل عال، ولها ربچ صغیر». «کەرخینی» یاقووت لە «کەرەکینی»ـً گۆڕاوە، کە ناوێکی ئەغریقییە، وەکو لە سەرەوە چۆنیی دروست بوونیمان پیشاندا.

ناوی «کەرەکینی»ی ئەغریقی لەسەر زمانی مرۆڤ ماوەتەوە، هەتاکو بووەتە «کەرخینی». لە دەمی ئیسلامیدا، کە لە پاشانا بووەتە ناو بۆ شاری کەرکووک. لام وایە ئەمە کاتێ رووی داوە کە ساسانیەکان هەرێمی کەرکووکیان بە سنوورەکەی ئێستایەوە ناوناوە «گەرمەکان». ئەم ناوەی هەرێمی کەرکووک کە تاریخ ناسی ئەرمەنی «موئێز خورین» کە لە سەدەی پێنجەمی میلادیدا ژیاوە بۆی بەجێ هێشتووین، ئارامیەکان بە زمانی خۆیان کردوویانە بە «بیپ گەرمایا» «باگەرمی»، بە عەرەبی کراوە بە «باجرمی». تۆمارەکانی کلێسە، ئەم ناوەیان نووسیوە بۆ هەرێمی کەرکووک، وە ناوی «کەرخاد بیپ سلوخ» بۆ شاری کەرکووک.

وەها رێکەوت کە ناوی «کەرخینی» بمێنێتەوە بە ناوێکی رەسمی هەتاکو سەدەی نۆیەمی هیجری، بۆ قەلاکەی کەرکووک، لەگەڵ ئەو دێیانە کە لە ژێر سوورەکانیا دروست کراون، کە بوونەتە گەرەك بۆی، وەکو ئێستا ئەیبینین:

ئێستا بێینە سەر باسی لێبوونەوەی ناوی کەرکووک: ئەوانەی لە شوێن جێگەی «کەرخینی» ئەگەڕێن، بەپێی باسکردنی یاقووت، وە لە ناوی کۆنی ئەم شارە ئەگەڕێن، ئی پێش ئەو دەمە، کە ناوەکەی ئێستای بۆ یەکەم جار لە نامەی تاریخی سووری (تەیموری لەنگ) بینراوە لە شکلی «کەرکووک»دا، لەلایەن شەرەفودین عەلی یەزدی»یەوە، لەناو رووداوەکانی (٨٠٦/١٤٠٣)دا، زوو تێی ئەگەین کە پەیوەندێیکی بنچینەیی هەیە لە مەیانی ناوی «کەرخینی»ی یاقووت و کەرکووك دا، ئەو زانایەی یەکەم جار پەیوەندی مەیانی ئەم دوو ناوەی بەدی کرد «هۆڤمان»ـە، وەکو لە مادەی کەرکووك دا لە ئانسیکلوپیدیای ئیسلامدا نووسراوە. بەلام «هۆڤمان» چۆنی لێکبوونەوەی ئەم دوو ناوەی بەیان نەکردووە.

لێبوونەوەی ناوی کەرکووك، وەکو من بۆی ئەچم: ئەتوانین ناوی کەرکووك بە ناوێکی بچووك کراوە دابنێین کە بە پێوەنووساندنی پاشبەندی (UK) بە دوای ناوی "کەرەك"وە دروست بووبێ. ئەم پیتە ئەچێتەوە سەر پیتی (KA)ی هیندی-ئێرانی کۆنی (١٥٠٠پ.م) ناسراوە، کە لە (سانسکریتی، ئاوێستایی)یەوە لە فارسیی کۆندا لە شکلی (KA و AKA، IKA)دا بەکارهێنراوە بۆ دروست کردنی ناوی ئاوەڵی ناو "صفت"، یان بۆ بچووك کردنەوەی مانای ناو. ئەم تیپانە ئێستا لە زمانەکانی ئێراندا، لەشکلی گۆڕاودان. لەم شکلە جوێ جوێیانە، ئەوانەی لە زمانی کوردییان ئەمانەن:

OK, OKA, UK,UkA

| ناو | ناوی بچووک کراو |
| --- | --- |
| گوند | گوندۆك (دێی بچووك). |
| دندان | دەندووك |
| مەنجەڵێ | مەنجەڵۆکە، مەنجەڵۆك |
| جن | جنۆکە |
| قەسر | قەسرۆك |

ئەم پیتە بچووکیانە، ئەخرێنە دوای ناوی تایبەتیشەوە، بۆ پێدانی مانای خۆشەویستی و نەوازشت، وەکو:

| ناو | ناوی بچووک کراو |
| --- | --- |
| رمچان | ڕەمووکە، ڕەمووك، ڕەموو |
| حسین | حەسۆکە، حەسۆن، حەسۆ |
| حبیب | حبیبە، حەبۆکە، حەبۆك، حەبۆ |
| اسماعیل | سمۆکە، سمۆك، سمۆ، سمکۆ |

له دروست کردنی ناوی تایبەتی بچووك کراودا، ناوەکە لەپێشا تووشی هەندێ کورت کراوی ئەبێ، وەکو ئەبینین کە لە بچووك کردنەوەی ناوی "اسماعیل"دا، لە حەوت تیپەکەی، پێنجی فڕێدراوە، ئینجا پیتە بچووك کەرەوەی هاوێژراوەتە سەر، کە بۆتە ناوی «سمۆکە»، ئەمیش لە هەندێ بۆتە «سمکۆ».

ئینجا بە پێی ئەم بنەیە، لە ناوی «کەرەکینی»، ناوی بچووك کراو دروست بووە، کە «کەرکووك»ـە، بەم بۆنەیەوە، پیتە بچووکەرەوەی (OCK)ی ئانگلۆ-ساکسۆنی کە لە خوارەوەدا ئەیبینن، شیاوی لێ ورد بوونەوەیە:

گردە بچکۆلە Hillock (Hill-OCk)

گای یەختە Bullock

میرگە بچکۆلە Paddock

پشت کورەلە Hummock

ئەشێ کە بنجی ئەم (OCK)، پەیوەندی هەبێ بە (KA) و (IKA)ی هیندی-ئێرانییەوە، ئەگەر ئەمە راست بێ، ئەوسا پیتی (KA)ی بە هیندی-ئێرانی ناسراوە، ئەبێ یەکێ بێ لە پیتە کۆنەکانی هیندی-ئەوروپایی بنجی.

بەڵام هەرچی وەکو بنجی ناوی "کەرکووك"بێ، کە بچووك کراوی "کەرکووك"ی لێ دروست بووە، پیاو نازانێ ئایاکو ئەمە ناوی "کەرەك"، "کەرەخ"ی کۆنە، یان لێبوونەوەیێکی تازەیە لە کەرکینی"، چونکە "کەرەك" کە "کەرکینی"ی لێبۆتەوە، ئەشێ خۆشی لە کەرکینی بووبێتەوە بە فڕێدانی سێ تیپەکەی دواییەوە، بۆ ئەوە کە ناوە بچووك کراوەکەی لێ دروست بێ، وەکو بەیانمان کرد، لێرەدا ئەم پرسە ئاساییە کۆنەم دێتەوە بیر: "مریشك لە هێلکەوە پەیدا بووە، یان هێلکە لە مریشك؟"

وام دێتە بەرچاو کەرەك، "کەرکووك"ی لێ بۆتەوە، "کەرەك"ی ئەسلییە، وە ناوی بچووك کراوی "کەرکووك"ی زۆر لەپێش ئەوەدا، کە ئەم ناوە، واتا ناوی "کەرکووك" بڵاوبێتەوە، لە سەردەمی سوڵتان ئەحمەدەوە.

تۆفیق وەهبی، یەکێکە لەو کەسایەتییە کوردانەی، توانیویەتی لە چەندین بواری جیادا ڕۆڵی هەبێت و چالاکی ئەنجام بدات، بەڵام وەك دەردەکەوێت ئەم کەسایەتییە زیاتر بە کارە ڕۆشنبیرییەکانی ناسراوە و سەرکەوتنی گەورەشی تێدا بەدەست هێناوە. دەسپێکی کارە ڕۆشنبیرییەکانیشی نووسینی نامیلکەیەك بووە بە زمانی تورکی بە ناوی (ماکینەلی تفنك) کە لە ساڵی ١٩١١ دەریکردووە، ئەمەش لەو کاتەدا بووە کە ئەفسەر بووە لە سوپای عوسمانی.

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و گەڕانەوەی بۆ کوردستان ، بارودۆخێکی گونجاوتر بۆ (تۆفیق وەهبی) هاتە کایە بۆ برەودان بە بواری ڕۆشنبیری، ئەمەش بەهۆی ئەو کەشوهەوا ئازادەی دوای نەمانی دەسەڵاتی عوسمانی ناوچەکەی گرتبووەوە، بە تایبەتی لە بواری دەربڕین و بڵاوکراوەکان. لەم بارودۆخە تازەیە (وەهبی) دەستی بە چالاکییەکانی کرد لە بوارە جیاوازەکانی ڕۆشنبیری. بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم بابەتە، پێمان باشبوو چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی بەسەر چەند بوارێك دابەشبکەین و یەکە یەکە لێیان دەدوێین.

## ١ـ بایەخدانی بە بواری خوێندن و فێرکردن:

تۆفیق وەهبی لە ژیانیدا، بایەخێکی زۆری بە خوێندن و فێرکردن داوە، ئەمەش لەم باوەڕەوە سەریهەڵدابوو، کە سەرچاوەی هەموو کێشەکان لە کۆمەڵگەی کوردەواری ـ بەتایبەت نەزانیی و پاشکەوتن ـ بۆ نەخوێندەواری دەگەڕێتەوە. شایانی باسە، یەکەم وتار کە (وەهبی) نوسیبێتی، لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) بڵاویکردەوە، مەسەلەی خوێندن و فێرکردنی ورووژاندووە، کە تێدا داوای کردنەوەی قوتابخانە دەکات لە شاری سلێمانی، هەروەها باس لە بایەخی فێربوون و ڕەنگدانەوەی لەسەر پێشکەوتنی کۆمەڵگە دەکات، داواش لە هاونیشتمانانی دەکات دەستی یارمەتی بۆ کردنەوەی قوتابخانە درێژ بکەن.

(وەهبی) ساڵی ١٩٣٠ دەبێتە موتەسەریفی سلێمانی، ئەمەش دەبێتە هاندەرێك بۆ ئەوەی بایەخی بە خوێندن و فێرکردن زیاتر بێت، هەوڵدەدا لە ڕێگای پۆستەکەیەوە بتوانێ خزمەتی زۆرتر لە بواری خوێندن پێشکەش بە خەڵکی شارەکەی بکات، بۆ ئەمەش گرینگییەکی زۆری بە قوتابخانەکان داوە، لەم ماوەیەدا ـ کە تەنها سێ مانگ لە پۆستەکەی ماوەتەوە ـ هەموو قوتابخانەکانی ناوەوە و دەرەوەی شاری سلێمانی بەسەر کردۆتەوە، لەم سەردانانەیدا ئەوەندەی بۆی کرابێت، پێداویستی قوتابخانەکانی دابین کردووە.

چالاکییەکانی (وەهبی) لەم بوارەدا، تەنها خۆی لە سەردانی قوتابخانەکان نابینێتەوە، بەڵکو کردنەوەی قوتابخانەش لەخۆ دەگرێت، بۆ نمونە کاتێ سەردانی گوندی(عەبابەیلێ) دەکات کە سەر بە قەزای هەڵەبجە بوو، بڕیاری کردنەوەی قوتابخانەیەکی سەرەتایی دەدات.

## ٢ـ ڕۆڵی لە بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ:

دانانی فەرهەنگ یەکێکە لە کارە هەرە گرنگ و دژوارەکان، چونکە بڵاوکردنەوەی ڕووبەڕووی چەندین کێشەی تیوری دەبێتەوە، بە تایبەتی کە وردبینی و لێکدانەوەیەکی زۆری دەوێت، هەروەها پێویستی بە زانیارییەکی زۆرە لەسەر زمان و مێژووی زمان و دیالیکتیکە جیاوازەکان و شێوەی نووسین، ئەمانە مەرجی زانستین بۆ هەر کەسێك بیەوێ کاری فەرهەنگ ئەنجام بدات.  ئاماژەمان بۆ کرد هەبوو، ئەمەش یارمەتیدەرێك بوو تا دەست بۆ کارێکی گرنگی وا ببات.

یەکەم کاریشی لەم بوارەدا، بڵاوکردنەوەی فەرهەنگێکی(عەرەبی ـ کوردی) بووە بە ناوی (فەرهەنگی گەلاوێژ) کە لە (٣٦٢) وشە پێکدەهات، ئەمەشی بە شێوەی هەفتانە لە گۆڤاری (گەلاوێژ) لە ژمارەکانی(٧ـ٨)ی ساڵی ١٩٤٢ تا ژمارە(٢)ی ساڵی١٩٤٣ بڵاوکردۆتەوە. ئەم فەرهەنگە هەرچەندە بە ناتەواوی مایەوە، بەڵام بە کارێکی زانستی گەورە لە قەڵەم دەدرێت، کەتێدا بەرامبەر هەر وشەیەکی عەرەبی چەند وشەیەکی کوردی بەکارهێناوە.

یەکێکی تر لەو کارە گرینگانەی لەم بوارەدا ئەنجامی داوە، ئەو فەرهەنگە (کوردی ـ ئینگلیزی)یەیە، کە لە ساڵی ١٩٦٦ بە هاوکاری لەگەڵ (س.ج.ئەدمۆندز)لە لەندەن بڵاویکردەوە، ئەم فەرهەنگە لە (١٧٩) لاپەڕە و (٢٠٠٠٠) وشە پێکهاتووە و بە پیتی لاتینی چاپکراوە، ئەم فەرهەنگە لەلایەن ناوەندە زانستی و ڕۆشنبیریەکان هەڵسەندگێنراوە، بە یەکێك لە کارە هەرە گەورەکانی توێژینەوەی کوردی بە گشتی و فەرهەنگی کوردی بە تایبەت لە قەڵەم دەدرێت.

## ٣ـ چالاکییەکانی لە بواری وەرگێڕان:

یەکێکی تر لەم بوارانەی کە (وەهبی) کاری تێداکردووە، بواری وەرگێڕان بووە، کە بە یەکێك لە بنەما گرینگەکانی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری دادەنرێت. ئەوی (وەهبی) لەم بوارە ئەنجامیداوە، وەرگێڕانی ژمارەیەك کتێب و وتار و بابەت بووە لە زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و تورکییەوە بۆ سەر زمانەکانی کوردی و عەرەبی. یەکەم چالاکیشی لەم بوارەدا، بریتی بووە لە وەرگێڕانی چەند نامیلکەیەکی سەربازیی لە زمانی تورکییەوە بۆ سەر زمانی کوردی، بە مەبەستی بەکارهێنانی لەلایەن لەشکری کورد لە مەشقە سەربازەکانیان لەسەردەمی حکومەتی دووەمی (شێخ مەحموود)١٩٢٢ـ١٩٢٣ .

دوای ئەم کارەی تا ماوەیەکی زۆر هیچ کارێکی لەم بوارەدا ئەنجام نەدا، تا لە ساڵانی چلەکانی سەدەی پێشوو جارێکی تر دەستی کردەوە بە کاری وەرگێڕان، بۆ ئەمەش چەند وتار و بابەتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە وەرگێڕا. لە ژمارە (١) ی گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە) سێ بابەتی وەرگێڕدراوی بڵاوکردەوە، دووانیان لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ سەر کوردی. لە ژمارە(٢)ی هەمان گۆڤار، وتارێکی(ئەدمۆندز)

ی بەناونیشانی (هەجوکەرێکی کورد، شێخ ڕەزا تاڵەبانی) وەرگێڕدراوە بۆ سەر زمانی کوردی، لە ژمارە(٣)ش، هەڵساوە بەوەرگێڕانی ئەو وتارەی (شا فەیسەڵ-ی دووەم) بە بۆنەی ڕۆژی لەدایکبوونی خۆی لە ساڵی(١٩٤٤ ) لەڕادیۆی لەندەن بڵاویکردەوە، لە زمانی عەرەبی بۆ سەر زمانی کوردی.

لە گۆڤاری (گەلاوێژ) یش بابەتێکی لە سەر بنەماڵەی پادشای بەریتانیا لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ سەر زمانی کوردی وەرگێڕاوە، دوا کاریشی لەم بوارەدا وەرگێڕانی کتێبی (کورد و تورك و عەرەب) ی (ئەدمۆندز)ە، کە بە کورتکراوەیی لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بە عەرەبی، لە گۆڤاری (پێشکەوتن) لە ساڵی١٩٥٨ بڵاوکردۆتەوە.

## ٤ـ ڕۆڵ و چالاکییەکانی لە کۆمەڵە و یانە ڕۆشنبیرییەکان:

لایەنێکی تری ڕۆشنبیری کە (وەهبی) بەشداری تێدا کردبێت، کار کردنی بووە لە کۆمەڵە و یانە ڕۆشنبیرییەکان ، یەکەم هەنگاویشی لەم چوارچێوەیەدا ئەندام بوونیەتی لە (یانەی سەرکەوتنی کوردان)، ئەم یانەیە کە چالاکییەکانی لە ماوەی نێوان ساڵانی(١٩٣٠ـ١٩٥٨)بووە، بەتەمەن درێژترین یانە دادەنرێت لە کوردستانی باشوور.

ـ ئەو کاتەی ئەم یانەیە لە بەغداد دامەزرا (وەهبی) موتەسەریفی سلێمانی بووە. بەڵام ساڵی دواتر، لە هەڵبژاردنی لێژنەکانی یانەکە، (وەهبی) خۆی پاڵاوتووە بۆ بەڕێوەبردنی لێژنەی کارگێڕی، لە ئەنجامدا توانیویەتی دەنگی یەکەم بەدەست بهێنێ، بەمەش بوو بە ئەندامێکی باڵای یانەکە، بە بەردەوامی لە یانەکە مایەوە تا داخستنی لە ساڵی١٩٥٨.

لە ماوەی ئەندام بوونی لەم یانەیە، (وەهبی) چالاکی زۆری نواندووە، لەوانە سەرپەرشتیکردنی خولی تایبەت بۆ فێربوونی زمانی کوردی، کە تێدا زمانی کوردی و دیالێکتیەکانی و نووسینی کوردی بەپیتی عەرەبی و لاتینی دەخوێنرا، هەفتەی دوو جار وانەکان دەگوترایەوە.

یەکێکی تر لەم کۆمەڵە ڕۆشنبیریانەی (وەهبی) ڕۆڵی گەورە و کاریگەری لە دامەزراندن و بەڕێوەبردنی هەبووە، گشت کۆبوونەوەکان لە ماڵی (وەهبی) ئەنجامدراوە ، کۆمەڵە توانی گۆڤارێك دەربکات بە ناوی (دیاری لاوان)، بەڵام ئەم گۆڤارە تەنها یەك ژمارەی دەرچوو، پاشان بەهۆی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەکە، گۆڤارەکەش ژمارەی تری لێ دەرنەچوو.

لە یانە عێراقییەکانیش کە (وەهبی) کاری تێدا کردووە(یانەی خامە)یە، ئەم یانەیە لە لایەن ژمارەیەك کەسایەتی ڕۆشنبیری عێراقی کە (وەهبی) یەکێك بوو لەوانە لە ساڵی ١٩٣٤ لە بەغداد دامەزراوە، ئەمەش وەکو لقێك لە (یانەی خامە)ی جیهانی، کە لە زۆربەی وڵاتان لقی هەبووە.

کاتێکیش (کۆڕی زانیاری عێراقی) لە ساڵی ١٩٤٧ لە بەغداد دامەزرا، (وەهبی) وەك تاکە ڕۆشنبیری کورد بۆ بەئەندام بوون لەم کۆمەڵەیە دەستنیشانکرابوو، ئەمەش بەهۆی ئەو ئاستە زانستییەی هەیبووە، هەروەها لە ١٢کانونی دووەمی ١٩٤٨ بە جێگری سەرۆکی کۆڕ هەڵبژێردرا، (وەهبی) بەردەوام بوو لە(کۆڕی زانیاری عێراق) تا لە شوباتی ١٩٤٩ دەستی لەکار کێشایەوە، ئەم کۆڕە گۆڤارێکی بەناوی خۆی دەرکرد، (وەهبی) بابەتێکی بەناوی (القصد و الاستگراد فی اصول معنئ بغداد) لە یەکێك لە ژمارەکان بڵاوکردەوە.

هەر لەدرێژەی کار و چالاکییەکانی لە بواری ڕۆشنبیری، (وەهبی) دەسپێشخەری بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری کرد لە بەغداد، بۆ ئەم مەبەستەش یەکەم کۆبوونەوەی لە ماڵی خۆی ئەنجامدا، کەتێدا بڕیاری دامەزراندنی(کۆمەڵەی نووسین و وەرگێڕان و بڵاوکردنەوە) درا، (وەهبی)ش بە سەرۆکی کۆمەڵەکە هەڵبژێردرا، یەکێك لە چالاکییە دیارەکانی کۆمەڵە بریتی بوو لە دەرکردنی گۆڤارێك بە ناوی (الکتاب)، ئەم گۆڤارە تەنها دوو ژمارەی لێ دەرچوو، پاشان بەهۆی ڕوودانی شۆڕشی ١٤ی تەموزی١٩٥٨ کۆمەڵەکە داخرا.

## ٥ـ چالاکییەکانی لە ژمارەیەك بواری ڕۆشنبیری تر:

اـ چالاکییە ڕۆشنبیریەکانی لەو کاتەی موتەسەریفی سلێمانی بووە:

تۆفیق وەهبی، ساڵی ١٩٨٤

لەم ماوەیەی موتەسەریفی سلێمانی بوو ، (وەهبی) بایەخێکی تایبەتی بە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری دەدا، بۆ ئەم مەبەستەش بە بەردەوامی پەیوەندی بە رۆشنبیرانەوە هەبووە و یارمەتی داون. یەکێك لەو کۆمەڵە رۆشنبیریانەی لەم ماوەیەدا پەیوەندی پێوەکردوون (کۆمەڵەی زانستی کوردان)بوو لە سلێمانی، هەر بۆیە بەشداری لە زۆربەی بۆنە و چالاکییەکانی ئەم کۆمەڵەیە کردووە، لەم بارەوە رۆژنامەی (ژیان) دەربارەی یەکێك لەم بۆنانە نووسیویەتی((موتەسەریفی سلێمانی بەشدار بوو لە ئاهەنگی کۆمەڵەی زانستی کە لە رۆژی هەینی ١٣ ی حوزەیرانی ١٩٣٠ ئەنجام درا، هەر لەم بۆنەیە موتەسەریف (١٠٠) روپیەی لە بەرکی خۆی پێشکەش بە کۆمەڵەی زانسی کرد)).

لەلایەکی تر کاتێ کۆمەڵەی ناوبراو ویستویەتی کتێبخانەیەکی تایبەت بە خۆی بکاتەوە بۆ خزمەتی رۆشنبیران و خوێندەواران، (وەهبی) یەکێك لەوانە بوو دەستی یارمەتی بۆ درێژکردوون، هەروەها(٤٠٠) روپیەی تریشی پێ بەخشیون کاتێ کۆمەڵە لە هەوڵی کڕینی (چاپخانەیەك)دا بوو.

ب ـ رۆڵی لە راگەیاندن:

رۆڵێکی گەورەی بینی لە کردنەوەی بەشی کوردی لە ئێزگەی بەغداد، کە لە رۆژی ٢٩ی کانونی دووەمی١٩٣٩ کرایەوە، دەربارەی ئەمەش (کامیل کاکەمین) یەکەم بەرێوەبەری بەشی کوردی لەم ئێزگەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات و دەڵێ: ((هەریەك لە موحەمەدئەمین زەکی و تۆفیق وەهبی بەشدارییەکی گەورەیان لە دامەزراندنی بەشی کوردی و یارمەتیدانی بەرێوەبەرایەتییەکەی هەبووە، جگە لەمەش وەرگێڕانی هەواڵەکان لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی بە سەرپەرشتی تۆفیق وەهبی بووە.

هەر لە چوارچێوەی چالاکییەکانی لە بواری راگەیاندن، (وەهبی) لە ساڵی١٩٤٣، گۆڤارێکی بە ناوی (دەنگی گێتی تازە) بە یارمەتی نووسینگەی پەیوەندییەکانی بەریتانیا لە بەغداد دەرکردووە، لەم بارەیەوە خۆی وتویەتی: ((ساڵی١٩٤٣ گۆڤاری دەنگی گێتی تازەم دامەزراند، کە لە ژێر سەرپەرشتی زمانەوانی خۆم دەردەچوو، وە رێگام نەدەدا بە بڵاوبوونەوەی هیچ بابەتێك پێش لێکۆڵینەوە لە راست و دروستی زمانەوانیەکەی)).

هەر چۆنێك بێت ئەم گۆڤارە هەنگاوێکی گەورەبوو لە مێژووی رۆژنامەوانی کوردی، بەهۆی ئاستی بەرزی زمانەوانی و قەبارە و دەرهێنانەکەی. گۆڤارەکە لەگەڵ ئەوەی تەرخانکرابوو بۆ پروپاگەندە دژی وڵاتانی (ناوەڕاست ـ محور) بە گشتی و ئەڵمانیا بە تایبەتی، کەچی بایەخێکی زۆری بە مێژووی ئەدەبی کوردی دەدا، لەمەشدا (وەهبی) رۆڵی گەورەی هەبوو، کەتێدا وتار و بابەتی جۆراوجۆری بە زمانی کوردی پەتی بڵاودەکردەوە، بۆ نمونە زاراوەی (رستە) یەکەم جار لەلایەن (وەهبی)یەوە لەم گۆڤارە بەکارهێنرا و پاشان لەلایەن نووسەرانی کورد بەکارهێنرا.

یەکێکی تر لەو کەناڵە راگەیاندنانەی (وەهبی) لە دامەزراندنیدا یارمەتیداوە (ئێزگەی رۆژهەڵاتی نزیك)بووە، کە لە لایەن بەریتانیەکانەوە لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی بۆ بەرپەرچدانەوەی پروپاگەندەکانی ئەڵمانیا بریاری دامەزراندنی داوە، ئەم ئێزگەیە لە شاری(یافا) ی فەلەستینیەوە شەپۆلەکانی بە زمانی کوردی ئاراستەی کوردستانی باشوور کردووە، بۆ ئەمەش (وەهبی) ئاسانکاری زۆری بۆ کردوون، ئەم ئێزگەیە جگە لە بەرنامە سیاسییەکانی، بایەخی داوە بە مێژوو و هۆنراوە و ئەدەب و زمانی کوردی، ئەمەش بۆ ئاستی بەرزی کارمەندەکانی دەگەڕایەوە کە لەلایەن (وەهبی)یەوە رەوانە کرابوون، لەوانە(گۆران)ی شاعیر و (رەفیق چالاك) ی هونەرمەند.

هەروەها پێویستە لەسەرمان ئەوە بزانین کە (وەهبی) لە

بواری نووسینی (کورتە چیرۆك)یش بەرهەمی هەبووە، لەم بوارەشدا کۆمەڵێك چیرۆکی بڵاو کردۆتەوە، لەوانە (بووکە سووریّ) و (بەختیار و بەدبەخت) و (کەر ئەحمەد) و (سێ کۆستە)، چیرۆکەکانی بەوە ناسراوەتەوە کە دەربڕینەکانی سادەن و مانای قووڵیان هەیە.

## ڕۆڵی تۆفیق وەهبی لە بواری زمانی کوردی

یەکەم: سەرەتای کارە زمانەوانییەکانی:

دوای کۆتایی هاتنی ج ج١ و دابەشبوونی دەوڵەتی عوسمانی، بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیری فراوان لەو ناوچانە سەریانهەڵدا. بەڵام ئەوەی ببووە کێشە لەبەردەم ئەم بزووتنەوە ڕۆشنبیرییە ، بریتی بوو لە نەبوونی نووسینێکی دیاریکراوی کوردی، بە مانایەکی تر پیتی کوردی تایبەتیان نەبوو بۆ نووسین، ئەمەش وەك خاڵێکی زۆر لاواز دەبینرا لە بزووتنەوەکە، بۆیە چەندین هەوڵی ڕاستەقینە درا بۆ دانانی ڕێزمانی زمانی کوردی.

لەم بوارەشدا بەتایبەت (تۆفیق وەهبی) پێگەی یەکەمی هەبوو لە نێوان ڕۆشنبیرانی کورد کە ڕۆڵێکی یەکجار گەورەی بینی لە خزمەتی زمانی کوردی، وە توانی چەندین دەستکەوت و پرۆژەی گەورە بەدیبێنێ بۆ بەرزکردنەوەی زمانی کوردی، وە یەکەم چالاکیشی لەم بوارەدا، ئەو وتارەی بوو کە لە گۆڤاری (دیاری کوردستان) بڵاویکردەوە، بەمەش دەرگای گفتوگۆی بۆ ڕۆشنبیرانی ئەوسای کورد کردەوە بە نووسینی وتار و بیروباوەڕی جیاواز و نوێ ، بە تایبەتی لەسەر بابەتی زمانەوانی، لەو کاتەدا ( تۆفیق وەهبی) کەوتە گفتوگۆیەکی توند لە گەڵا ( ئیسماعیل حەقی شاوەیس) لەسەر جۆری ئەو پیتانەی کە پێویستە لە نووسینی کوردی بەکاربهێندریّ، ( وەهبی) لە ڕێگای ئەو دوو وتارەی بڵاویکردبۆوە، بە پێویستی زانیبوو پیتی عەرەبی بەکار بهێنرێت لە نووسینی کوردی، لە هەمان کاتدا ( ئیسماعیل حەقی شاوەیس) جەختی لەسەر ئەوە کردبۆوە کە پیتی عەرەبی گونجاو نییە بۆ نووسینی کوردی بە کار بهێنرێت.

لە لایەکی تر لە کاتی هاوکاریکردنی لەگەڵا کۆمەڵەی ( بژاری کوردی ) لە ساڵی ١٩٢٨، خزمەتێکی زۆری پێشکەش کرد، کە توانای خۆی خستبووە گەڕ بۆ دانانی وشەی کوردی لە شوێنی وشەی بێگانە، بە پێی توانا لە بوارە ڕۆشنبیرییە جیاوازەکان، ئەمەش لە ئەنجامی ئەم تازەگەریانە بوو کە لە گۆڕەپانی سیاسیدا سەریانهەڵدابوو کە پێشتر لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان بوو، ئەمەش ناوچە کوردییەکانی لێ بێبەش نەبوو، ڕۆشنبیرانی کوردیش تواناکانیان بەگەڕ خستبوو بۆ پێشخستنی بوارە جیاوازەکانی ڕۆشنبیری، بڵاوکراوە کوردییەکان لەم سەردەمەدا بە دیار کەوت، ئەمەش کاریگەری لەسەر هۆشیاری سیاسی و زانستی و ئەدەبی هەبوو.

### دووەم: نووسراوە زمانەوانییەکانی:

### ١/ دەستوری زمانی کوردی :

یەکێك لە گرنگترین کارەکانی (وەهبی) لەبواری زمانەوانی، دانانی کتێبێك بوو بە ناوی ( دەستوری زمانی کوردی)، کە لە (١١٤) لاپەڕە پێکهاتبوو، بۆ دانانی ئەم کتێبە ( وەهبی) چەندین ساڵ لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٢٣-١٩٢٩ کاریکردووە و بەردەوام بووە. ئەم کتێبە پیت و جوڵەکانی تێدا دیاریکراوە، ئەمە جگە لە بکەر و ناو و زمانی کوردی . ئەمە وەك بەشی یەکەم ناسرا، بەڵام پاشان (وەهبی) کارەکەی ڕاگرت و هیچ بەشێکی تری بە دوادا نەهات.

ڕۆژنامەی ( ژیان) هەواڵی دەرچوونی ئەم کتێبەی بڵاوکردۆتەوە وەك ( موژدەیەك بۆ نەتەوەی کورد) نیشانیداوە، ئاماژەشی بۆ ئەوە کردووە، یەکەم کتێبە لەم جۆرە کورد بە خۆیەوە دەیبینێ. بەڵام حکومەتی عێراقی ئەو کاتە ڕێگای نەدا بەکار بهێنرێ وەك مەنهەجێك لە قوتابخانەکان و بواری فێرکردن، کە ئەمەش ڕۆشنبیران و مامۆستایانی کوردی نیگەران کرد، کە چەندین وتار و بابەتیان لەسەر ئەم ڕێگرییە نووسی.

لە لایەکی تر ( وەهبی) هەڵسا بە وەرگێرانی ئەم کتێبە بۆ سەر زمانی عەرەبی لە دوو بەشدا، ئەمەش لە ساڵی ١٩٥٦، ئامانجیش لەم کارەدا هەروەك خۆی ئاماژەی بۆ کردووە: ( هەر عەرەبێك ویستی فێربوونی زمانی کوردی هەبێت بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە فێر دەبێت).

هەروەها لە گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە)ش بە شێوەی وتار بڵاویکردەوە، ئەمەش بە گرینگترین کاری ( وەهبی) دادەنرێت لە بواری زمانەوانی، چونکە بەم کارەی ئەو بە یەکەم کورد دادەنرێت کە هەڵساوە بە جێگیر کردنی بنەماکانی نووسینی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی لەگەڵ دانانی ئاماژە تایبەتییەکان.

### ٢/ خوێندەواری باو:

یەکێکی تر لە کارە ڕۆشنبیرییەکانی تری لەم چوار چێوەیە، نووسینی کتێبی ( خوێندەواری باو) بوو، ئەم کارەی لە ساڵی ١٩٣٣ ئەنجامداوە، لە چوار بەش و (٤٤) لاپەرە پێك دێت، وە بە پیتی لاتینی نووسیویەتی، ئەمەش وەك هەوڵێك بوو بۆ چۆنیەتی بە کارهێنانی پیتی لاتینی لە نووسینی کوریدا، بۆ ئەمەش هەڵساوە بەسەر لە نوێ دارشتنەوەی چەند وشەیەکی کوردی بە پێی ڕێزمانی زمانی کوردی.

### سێیەم: هەوڵەکانی لە بڵاوکردنەوەی پیتە کوردیەکان لە چاپخانە و ئامێری (لاینو تایب):

یەکێکی تر لەو کێشانە ڕووبەڕووی نووسینی زمانی کوردی بووەوە و (وەهبی)ش هەوڵێکی زۆریدا بۆ چارەسەرکردنی، نەبوونی ئەو پیتە عەرەبییانە بوو کە



تۆفیق وەهبی

هێمای لەسەر بوو لە چاپخانەکان، بۆ ئەمەش (وەهبی) لە هەوڵدان بوو لەگەڵ خاوەن چاپخانەکان بۆ دروستکردنی پیتە کوردییە تایبەتییەکان ،لەم پێناوەشدا ساڵی ١٩٥٦سەردانی(بەیروت)ی کرد و سەرپەرشتی دروستکردنی ئەم پیتە کوردییانەی کرد، بەشی یەکەم و دووەمی(قواعد اللغه الکردیه)ی خۆی پێ چاپکرد. لەلایەکی تر، کاتێ ئامێری (لاینوتایپ) لە بەغداد بە دەرکەوت، ئەمە پێش ڕۆیشتنی بۆ بەیروت بوو، (وەهبی) داوای لە هونەرمەند (بەدیع باباجان) کرد، هەڵسێ بە نووسینی هەموو پیتە کوردییە تایبەتەکان بە جیا لەسەر کارتۆنێك، ئینجا وێنەی بگرێ بە(مایکرۆفلم)، ئەمەشی لە ڕێگای خاوەن چاپخانەکانی بەغداد ڕەوانی ئەڵمانیا کرد بۆ دروستکردنی چوارچێوەی پیتەکان، ئەم پرۆژەیە لە ساڵی ١٩٥٧تەواو بوو گۆڤاری(پێشکەوتن) ی پێ بڵاوکردەوە، ئەمەش بە یەکێك لە کارە هەرە بەرزەکانی دادەنرێت بۆ ژیاندنەوەی زمانی کوردی، تەنانەت یەکێك لە نووسەرەکان پێیوایە مێژووی نووسینی زمانی کوردی، لەم ڕووداوەوە دەست پێدەکات.

## چوارەم: بەرهەمەکانی:

### ١ـ بڵاوکراوەکان:

لە زانیارییەکانی پێشوتر بۆمان بە دیارکەوت، کە(وەهبی) لە چەندین بواری ڕۆشنبیری کاریکردووە، ژمارەیەکی زۆری لە کتێب و توێژینەوە و وتار نووسیوە. نووسینەکانی کورتن لە ڕووی لاپەڕەوە، هیچ نووسینێکی لە(٦٠) لاپەڕە زیاتر نییە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شێوازە زانستی و قووڵەکەی کە لە ناوەڕۆکی بابەتەکانی دەردەکەوێت، بۆیە دەبینین زۆربەی توێژینەوەکانی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بڵاوکردۆتەوە، ئەمەش بەشێك لە کتێب و وتار و توێژینەوەکانیەتی:

#### اـ کتێبەکان:

١ـ رجعیه المانیه و عباده القوه ( لماذا تنحدر المانیه النازیه)
٢ـ ابعاد معنئ الیحمور عن اسم الملك بهرام گور.
٣ـ سفره من دربند بازیان الئ ملەی تاسلوجه.
٤ـئەشکەوتی گوندۆك.
٥ـ the yazidis are not devil warshippers
٦ـ the remans of Mithraism in hatra and iraq Kurdistan and its traces in yazidism

#### ب ـ توێژینەوەکان:

١ـ القصد و الاستطراد فی اصول معنئ .
٢ـ التون کوبرو( الجسر الذهبی ).
٣ـ اصل اسم کرکوك .
٤ـ قلعه کیانه فی شمال السلیمانیه .
٥ـ اصل تسمیه شهرزور.

#### ج. وتارەکانی :

١ـ ملاحضات عن تکوین سهل السلیمانیه .
٢ـ کورد و زمانی کوردی .
٣ ـ مامە یارە .
٤ـ زنجیرە وتار لە بابەت بنج و بنەوانی زمانی کوردی .
٥ـ بەرامبەر بە (غارە)ی عەرەبی لە کوردیدا چی وشەیەك بەکاربهێنین.
٦ـ تەنقید.
٧ـ شیعرەکانی (مەلیکولکەلام) ی سنە.
٨ـ تەنقیدی وتاری (ڕۆژهەڵاتناسی سرهنری رولینسن).
٩ـ باکور- شیمال، نیوەڕۆ- جنوب.
١٠ـ یەك دوو وێنە لە شیعر و فەلسەفەی بەرزی ئەحمەدی خانی.
١١ـ پسپۆر، ازاد(ازا ، زات)، شارەزا.
١٢ـئەحەی کوڕنو.
١٣ـ سەلام سەردەقی شکاند.
١٤ـ زمانی کوردی.
١٥ـ لێکۆڵینەوە لە مانای شەفەق.
١٦ـ بەخێوکردنی زمانەکەمان بە وشەی وێژە.
١٧ـ تکایەکی تایبەت لە کۆواری بەڕێزی هەتاو.
١٨ـ سوپاس.
١٩ـ بێژانەوەی وشە.
٢٠ـ دەستور.
٢١ـ فۆتۆگراف.
٢٢ـ پیرەمەگروون.
٢٣ـ بۆ جەنابی مامۆستامان مامۆستا سەعید سدقی.
٢٤ـ ئەسلی پیتە قالبی(ئە) ی شێوەی سلێمانی .
٢٥ـ الانحدار التاریخی لاسم کرکوك.
٢٦ـ اصل اسم(قەلاچولان).
٢٧ـ کۆڵینەوە لە مانای پەروەردە و زانست .
٢٨ـ زانیاری گشتی.
ئەمە جگە لەوەی بە دەیان توێژینەوە و وتاری بڵاونەکراوەی لە دوا بەجێماوە.

بەداخەوە تا هەنووکە ناوەندی ئەکادیمی ئێمە وەك پێویست ڕۆشنبیرە دیار و خاوەن قەڵەم و پێشەنگەکانی بەسەر نەکردووەتەوە، ئەوەشی تا هەنووکە کراوە جێگەی ئومێد نییە و دەبێت بۆ لەمەودوا ناوەندە ئەکادیمی و زانکۆکانمان بە تایبەتیش بەشە زانستییە مرۆییەکان زیاتر لەسەر بەرهەم و ژیاننامە و شاکاری ئەو نووسەر و ڕۆشنبیرانە هەڵوێستە بکەن کە خزمەتێکی گەورەیان بە ڕۆشنبیریی نەتەوەکەمان کردووە، ئەگەر بۆ ئەو ناوانەش بگەڕێین دەیان ناوی وەك تۆفیق وەهبی و محەمەد ئەمین زەکی بەگ و نەجمەدین مەلا و عەبدوڵڵا جەوهەر و مەلای گەورە و مەلا شکور و مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی بەرچاو دەکەون، ڕەنگە ئامادەیی ئەم کەسایەتییانە لە نامەی ماستەر و دکتۆرادا زۆر کەمن و جێگەی نیگەرانین.
ئەوەی لەم چەند ڕۆژەدا بە ڕێکەوت بەرچاوم کەوت نامەیەکی دکتۆر سۆزان کەریم مستەفا بوو لەسەر ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدار ومێژوونووس و زمانەوانی دیاری کورد تۆفیق وەهبی، کە ئەم کتێبە لەلایەن شارەوانی سلێمانییەوە چاپ کراوە لە بنەڕەتیشدا ئەم کتێبە نامەیەکی بەکالۆریۆسی ئەو خانمەیە وەك بڕوانامەی زانکۆیی لە بەشی مێژووی زانکۆی سلێمانی، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بە نیازبوون ڕۆڤارێکی تایبەت بۆ مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگی کوڕی پیرەمەگروون دەربکەن، بۆیە بە باشم زانی خوێندنەوە و ڕانانێکی خێرا بۆ ئەو کتێبە بکەم بە هیوای ئەوەی هاندەرێك بێت بۆ توێژەران و خوێندکارانی زانکۆ و مامۆستایان و پسپۆڕانی ئەو بوارە کە زیاتر لایەك لەم ڕۆشنبیرانە بکەنەوە.
نامەیەکی دکتۆر سۆزان کەریم مستەفا بە ناونیشانی تۆفیق وەهبی. ژیاننامە و ڕۆڵی لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردیدا، هەرچەندە کتێبەکە بە قەبارە بچووکە و لە دوو توێی (٨٥ لاپەڕە)دایە، بەڵام بە زانیاریی دەوڵەمەندە و کۆمەڵێك ڕەهەند و لایەنی گرنگی لەسەر تۆفیق وەهبی خستووەتە ڕوو کە هەریەکەیان کۆمەڵێك چەمك و لایەنی بایەخداری لەسەر ئەو تێدایە.
ئەم کتێبە دابەشکراوە بەسەر دوو بەش و چەند تەوەرێکدا، بەشی یەکەم جگە لە پێشەکییەکی کورتی نووسەر، ژیاننامەی تۆفیق وەهبی و لە دایکبوون و خوێندنی خراوەتە ڕوو، لە بەشی دووەمیشدا نووسەر هەڵوێستە لەسەر پەیوەندییەکانی تۆفیق وەهبی لەگەڵ شێخ مەحموودی نەمر و لەگەڵ ئینگلیزەکاندا دەکات و شیکاری هەریەك لەو پەیوەندییانە دەکات لەسەر بنەمای مێژوویی و بارودۆخی ئەو کاتەی کۆمەڵگەی کوردی لە ڕووی سیاسی و جوگرافی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت نێودەوڵەتیشەوە.
لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا نووسەر باس لە ڕۆڵ و کاریگەریی تۆفیق وەهبی دەکات لە سوپا و پەرلەمانی عێراق و دواتریش ڕۆڵی لە پێشخستن و خزمەتکردنی کولتوور و ڕۆشنبیریی و زمانی کوردیدا و سەرجەم ئەو توێژینەوە و ئەدگار و بەڵگانە دەخاتە ڕوو کە ئەو لە بەرهەم و چالاکییەکانیدا

خزمەتی بە کورد کردووە و وەك سەرچاوەیەکی گرنگی ڕۆشنبیریی نەتەوەییش ئاماژەیان بۆ دەکات، لە بەشەکانی کۆتایی کتێبەکەدا نووسەر ژمارەی کتێبەکانی نووسەر لە بواری زمان و مێژوودا دەخاتە ڕوو، پاشانیش ئەو وتارانەی ئاماژە پێ دەکات کە پێشتر لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوە کوردی و عێراقییەکاندا لەسەر کورد نووسیونی و وەك یەکێك لە پایە گرنگەکانی ڕۆشنبیریی و خزمەتکردن بە دۆزی نەتەوایەتی ئاماژەی بۆ دەکات، دەکرێت لێرەشدا ئاماژە بە هەوڵێکی بنکەی ژین بکەین لە شاری سلێمانی کە لە هەنگاوێکی گەورەدا توانییان سەرجەم بەرهەم و وتارەکانی ئەم نووسەر و مێژوونووسەیان بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بڵاوکردووەتەوە، دەکرێت ئەمەش وەك یەکێك لە هەوڵە گەورە و مەزنەکانی دونیای ڕۆشنبیریی کوردی لێی بڕوانین.

لە بابەتی پەیوەندییەکانی تۆفیق وەهبی لەگەڵ حکومەتەکەی شێخ مەحموددا و لە لاپەڕە ١٨ ی ئەم کتێبەدا نووسەر دەڵێت "تۆفیق وەهبی بەگ، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩١٨ خولی ئەرکانی لە ئەستەنبوڵ تەواو کرد، لە ساڵی ١٩١٩ گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و یاوەری شێخ مەحموودی نەمر بووە بە پلەی ئەفسەری بیگباشی لە حکومەتەکەیدا، لە سلێمانیدا جگە لەوانەی کە لە حوجرەی مزگەوتەکاندا پێگەیشتبوون و ببوون بە خوێندەوار، ئەوانەی لە مەکتەبی ڕووشدییەی عەسکەری دەرچووبوون، ژمارەیەکی زۆریان ببوون بە کاربەدەست و ئەفسەر لە سەردەمی عوسمانیدا و لە دوای ڕووخانی حکومەتەکەی شێخ مەحموود لەناو دەزگاکانی دەوڵەتی عێراقدا جێگەی دیاریان هەبووە، گرنگترینیان تۆفیق وەهبی و محەمەد ئەمین زەکی بەگ بوون، شێخ مەحموود هەموو ڕاوێژێکی پێدەکردن و پشت و پەنای شێخ مەحموود بوون لە فەرمانڕەوایی کردنی دەوڵەتدا، بە تایبەتیش لە ڕووی سەربازیی و ڕۆشنبیریدا."

ئەوەی من لەسەر ئەم پەڕەگرافەی نووسەر هەمە ئەوەیە کە ئاماژەی پێ نەداوە کە لەگەڵ هاوکاری شێخ مەحموود و تۆفیق وەهبی، بەڵام وەك د.کەمال مەزهەر دەڵێت "ئەو هەڵانەی شێخ کردی لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ئینگلیزدا، تۆفیق وەهبی نەیکرد، چونکە تۆفیق وەهبی پێی وابوو هاوکاری کردنی ئینگلیز دەرفەت دەسازێنێت بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی کورد لە کوردستانی عێراقدا."

تەنانەت لە بەشێك لە بەڵگەنامەکانی مۆزەخانەی دیکۆمێنتی و دەستنووسی بەریتانیدا کە ئێستا لە لەندەن پارێزراوە و ساڵی ١٩٩٩ ڕێگەی بڵاوبوونەوەی پێدرا، لە نامەیەکی یەکێك لە بەرپرسە سەربازییەکانی ئینگلیز بۆ بەرپرسی باڵای هێزە چەکدارەکانی بەریتانیا نووسیوویەتی "پێویستە دەوڵەتی شکۆمەندی ئینگلیز بەیەك چاو سەیری شۆڕشگێڕە کوردەکان نەکات و ئەوەی شێخ کردی ئێسا دەیان سەرباز و پلە تایبەتی سەربازی لە بەغدا هاوکارمانن بۆ گێڕانەوەی بارودۆخی ئاسایی وڵات و دروستکردنی پۆلیسی نیشتیمانی

عێراق، بە تایبەتیش ئەو ئەفسەرە کوردانەی کە لە کۆلێژە سەربازییەکانی بەغدا و ئەستەنبوڵ و لەندەندا خوێندوویانە و پێیان خۆشە پشتگیریی هەوڵەکانی ئێمە بن."
ئەم نامەیە و ناوەڕۆکەکەی ئەوەمان پێ دەڵێن، مەبەستی ئەو سەربازە کوردانە ڕەنگە یەکێکیان تۆفیق وەهبی بوو بێت، گەر ئەو نامەیەش نەبوایە بیرکردنەوە و کارەکانی تۆفیق وەهبی بەڵگە بوون لەسەر دووبارەنەکردنەوەی ئەزموونی حوکومڕانی شێخ مەحموود، بە تایبەتیش لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئینگلیز و حوکمی خۆ بەڕێوبردندا، دەبوایە لەم کتێبەدا ئەو خانمە نووسەرە بە چەند دێڕێکیش بوایە ئاماژەی بۆ ئەو جیاوازییانەی نێوان شێخ مەحموود و تۆفیق وەهبی بەگ بکردایە.
لە بەشێکی تری ئەم کتێبەدا، نووسەر زۆر بەجوانی کێو ماڵی وتار و بابەتە زمانەوانی و ڕۆژنامەوانییەکانی تۆفیق وەهبی دەکات، بەڵام دیارە بەهۆی سنووردارکردنی باسەکە و ناوەڕۆکی کتێبەکەیەوە نەیتوانیووە کۆنترۆڵی هەموو وتارەکانی تۆفیق وەهبی بکات، کە گرنگترینیان بە بڕوای من ئەو وتارەیە کە لەسەر بنج و بنەوانی زمانی کوردییە و پێشتر لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوی کردووەتەوە. مامۆستا تۆفیق وەهبی لەو وتارەی گەلاوێژدا لەسەر ئەم بابەتەی خۆی دەڵێت " ئامانجم لە بڵاوکردنەوەی وتارەکانی "بنج وبناوانی زمانی کوردی" لە (گەلاوێژ)ی خۆشەویستدا، ئەوە بوو کە بچینە ناو ئەم گەنجینەوە، وە پێکەوە بە شینەیی تێیدا بسووڕێینەوە. کەچی لەپاش بڵاوکردنەوەی وتاری نۆیەم، وەها ڕێکەوت کە خەریکی هەندێ کاروباری تر ببم، وە بە دەمێ (موقتا□) دەس لەوان هەڵگرم. بەڵام هەمیشە بەداخەوە دێم و ئەبینم کە کوردەکان، زمانەکەی خۆیان ئەبەنەوە سەر زمانی پەهلەوی، وە بە پەهلەوییەوە ئەنازن. لەبەرئەوە بە پێویستم زانی، لە بەرەوە هەندێ زانیاری لەبارەی تیرەی زمانەکەمانەوە بڵاو بکرێتەوە. لە وتاری چوارەممان لە باسی دروستبوونی شێوەکانی کوردی و باسی وشەی "کرمانج"دا، زانیارییەکی زۆر کورتی بە کەڵکم بڵاو کردبووەوە لە بارەی تیرەی زمانی کوردییەوە. پیشانم دابوو کە زمانی کوردی لە تیرەی زمانی فارسیی کۆن -پەهلەوی- فارسیی تازە نییە. ئەم وتارەشمان کورت ئەبێ، بەڵام ئەو زانیارە گشتییانەی تێدا ئەبێ کە زانینیان پێویستە لەبارەی تیرەی زمانەکەمانەوە."
لە بارەی بنەچەی زمانی کوردیش لەگەڵ زمانی ئاری و زمانە کۆنەکانی تری ڕۆژهەڵاتدا و چۆنییەتی درووستکردن و لێکچوون و جیاوازی نێوان زمانی کوردی و زمانی ئاری، بە تایبەتیش زمانی ئێرانییەکان و ئەفغانستان و بەلوجستان، لەو وتارەیدا لەسەر بنەچەی زمانی کوردی و ئارییەکاندا دەڵێت" ناوی ئاری کە دراوە بە نەتەوەیەکی زانراو لە سیفەتێکی ئەریە هاتووە، کە بە ئاوێستایی لە شکڵی ئەیریە دایە، کە لای زۆرترینی زاناکان وایە کە ماناکەی سەر ڕاست و نەجیب و عالی جەناب بێ، ناوەکە لە فارسیی کۆندا (زمانە بەردەنووسەکانی هەخەمەنشی) لە شکڵی ئەریە و لە فارسیی ناوەڕاست (زمانی پەهلەوی) و لە فارسیی تازە (فارسیی دەوری ئیسلامی)دا لە ئێسکی ئاڕ دایە. بە سانسکریتی ئەریە بەو قەومە ئەڵێن کە زمانەکەیان ویدەییە، بەڵام ناوی ئێران پێدراوە بە وڵاتێکی زانراو لە سیفەتێکی ئەریەنەوە هاتووە، کە لە ئاوێستادا لە ئێسکی ئەیریانە و لە پەهلەوی و فارسیی تازەدا لە شکڵی ئێران دا ئەبینین و ماناکەی عائید و تایبەت بە ئاریەکان و وڵاتی ئاریەکانە بە شێوە زاری ئێران کە ئێستا زمانزەدە شکڵێکی تازەی چەند سەد ساڵەی ئێرانە، ئێستاش گەلێ لە ئێرانیەکانی وەکوو خەڵکی هەندێ ناوچەی فارس و ئەفغانستان و بلووجستان و کوردەکان... هتد، ئێرانی پێ ئەڵێن."
ئەم ساغکردنەوە زمانەوانییە و نزیکییەی زمانی کوردی لە زمانی ئارییەکانەوە و چۆنییەتی لێکچوون و جیاوازی کردنی لەلایەن تۆفیق بەگەوە، خاڵێکی هەرە گەش و گەورەی ئەوە کە پێش زیاتر لە ٦٠ ساڵ لەمەوبەر توانییویەتی شیکاری بکات، بۆیە دەکرێت لە ئێستاشدا ئەم بابەتە زمانەوانییەی مامۆستا تۆفیق بەگ خوێندنەوەی جیاواز و شیکاری جیاوازی بۆ بکەین، بۆ ئەوەی نەوەی نوێ و ناوەندە ئەکادیمییەکانمان لە بایەخ و کاریگەریی زمانەکەمان زیاتر تێ بگەن.

